


# سوود و موعجیزەکانی سورەتی البقرة

ئامادەکردن و کۆکردنەوە لەلایەن:

بنار صديق

2023

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## {پێشەکی}

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على رسول الله وآله ، وبعد سەرەتا زۆر سوپاس بۆ الله تعالى کە هاوکاری کردم بۆ کۆکردنەوەی ئەم بابەتەبەسودانە لەسەر سوود و مووعجیزەکانی سورەتی البقرە ئامانجم تەنهارازی بوونی الله یە دواتریش سوود گەیاندنە بەموسڵمانان ئەوانەی کە هەرشتێک خەمباری کردوون یان نەخۆشن یان بەهۆی سحرو چاو نەفس گیریان خواردوە یان ئاواتێ کیان هەیە إن شاءالله ئەم کتێبە سادەیە دەبێتە رێگا چارەیک بۆیان لەم کتێبەدا چەند چیرۆکێکی لەخۆگرتەوە و لەگەڵ فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ کە ئومێد بەخشە بۆ ئەوانەی بەهۆی نەخۆشیی دەرونی و جەستەییەوە ئەناڵێنن دەبێنە هیوایەک و هاندەرێک بۆ ئەوانەی کە دەستیان بە خوێندنی سورەتی البقرە کردوە ئەوانەشی کە هێشتا دەستیان پێ نەکردوە وەهەروەها خودای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت قورئان شفایە بۆ ئیمانداران.

**( وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا )** الإسْرَاء : ٨٢

واتە : ئێمە لەم قورئانەدا بۆ تۆمان ناردووە ئەی موحەممەد-صلى الله عليه وسلم- گەلێ ئایەت و سوورەت دادەبەزێنین کە مایەی شیفاو چاکبوونەوەیە لە نەخۆشیی نەفامیی و گومڕایی و سەرلێشێواویی دڵەکان، ڕەحمەت و بەزەیی و میهرەبانیشە بۆ خەڵکانی بڕوادار لەگەڵ ئەمەیشدا بۆ ستەمکاران و خوانەناسان جگە لەمە کە دەبێتە مایەی زیان بۆیان و پتر یاخییبوونیان شتێ تر زیاد ناکات بۆیان، چونکە خۆیان ئامادەنین هیچ سوودێکی لێوەرگرن. إن شاءالله ئەم کتێبە دەبێتە ڕێگای دەربازبوون لەهەموو ناخۆشیەک و دەبێتە دەرگایی فەرعوو خۆشی و گەیشتن بەئاوتەکان بەئزنی الله تعالى.





# {ناوەڕۆک}

## {وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ}

❁قورئان هەمووی چارەسەرو شیفایە بۆڕوح و جەستەخوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ڕایگەیاندووە کە قورئان شیفاو چارەسەرە کە دەفەرمویت: **( وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا لَوْلَا فُصِّلَتْ آيَاتُهُ ۖ أَأَعْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاءٌ ۖ )** فُصِّلَتْ : ٤٤

واتە : ئەگەر ئەم قورئانەمان بەزمانی گەلانی تر بناردایە ، ئەوا بێ باوڕان دەیان ووت ئایە نەدەبوو ئایەتەکانی ڕوون و ئاشکرابوایە بەزمانی خۆمان بوایە ، چۆن دەبێت قورئان بەزمانی بێگانە بێت ؟ لەکاتێکدا محمدﷺ بەعەرەبی دەدوێت؟! ئەی پێغمبەرﷺ پێیان بڵێ ئەم قورئانە بۆئەوانەی باوڕیان هێناوە هیدایەت وا ڕێنوینی شیفایە و چارەسەری هەموو دەرد و نەخۆشی یەکان دەکات جا ئەوانەی باوڕ ناهێنن گوێچکەیان کەڕەو بەشتی تر ئاخنراو ، هەروەها کوێرن لەئاستیدا ، ئەوان هەروەکو لەدوورەوە بانگیان لێ بکرێت وایە نەدەنگ کە باچاکی دەبیستین وڕەنگەکە بەڕوونی دەبینین ."

وەهەروەها دەفەرموێت: **( وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا )** الإسْرَاء : ٨٢

واته : ئێمه لەم قورئانەدا بۆ تۆمان ناردووه ئەی موحەممەد-صلى الله عليه وسلم- گەلێ ئایەت و سوورەت دادەبەزێنین کە مایەی شیفاو چاکبوونەوەیە لە نەخۆشیی نەفامیی و گومڕایی و سەرلێشێواویی دڵەکان، رەحمەت و بەزەیی و میهرەبانیشە بۆ خەڵکانی بڕوادار لەگەڵ ئەمەیشدا بۆ ستەمکاران و خوانەناسان جگە لەمە کە دەبێتە مایەی زیان بۆیان و پتر یاخییبوونیان شتێ تر زیاد ناکات بۆیان، چونکە خۆیان ئامادەنین هیچ سوودێکی لێوەرگرن!. وەلێرەدا بۆدەرخستنی ڕەگەزەکەیە "جنس" نەک بۆ چەنداندن " التبعيض " چونکە قورئان هەر هەمووی چارەسەرە هەروەکو لە ئایەتی پێشەکی یەکەدا ڕونی کردۆتەوە . قورئان چارسەر و شیفایە بۆ دڵەکان لەدەردی نەزانین و گومان ، هیچ کاتێک خوای گەورە چارەسەرو شیفای سوودو پوخت و گونجاوی وەکو قورئان نەناردۆتە خوارەوە . وە لە " صحيحين " دا هاتووە لەفەرموودەی " أبی سعيد " رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ووتی : " انطلق نفر من أصحاب النبي - صلى الله عليه وسلم - في سفرة سافروها ، حتى نزلوا على حي من أحياء العرب فاستضافوهم ، فأبوا أن يضيفوهم ، فلُدِغ سيد ذلك الحي، فسعوا له بكل شيء لا ينفعه شيء ، فقال بعضهم : لو أتيتم هؤلاء الرهط الذين نزلوا ، لعله أن يكون عند بعضهم شيء ، فأتوهم ، فقالوا : يا أيها الرهط إن سَيِّدنا لُدِغ ، وسعينا له بكل شيء لا ينفعه شيء ، فهل عِند أحدٍ منكم من شيء؟ فقال بعضهم : والله إني لأرقي ، و لكن والله لقد استضفناكم فلم تُضَيِّفونا ،

فما أنا براق حتى تجعلوا لي جعلًا ، فصالحوهم على قطيعٍ من الغنم ، فانطلق يتفل عليه ويقرأ { الحمد لله رب العالمين } فكأنما نشط من عُقَّالْ ، فانطلق يمشي ، وما به قلبة ، فأوفوهم جُعلهم الذي صالحوهم عليه ، فقال بعضهم : اقتسموا ، فقال الذي رقى : لا نفعل حتى نأتي النبي - صلى الله عليه وسلم - فنذكر له الذي كان ، فننظر ما يأمُرنا ، فقدِموا على رسول الله - صلى الله عليه وسلم - فذكروا له ذلك ، فقال : وما يدريك أنها رقية ؟ ثم قال : قد أصبتم ، اقتسموا و اضربوا لي معكم سهماً "

واتە : پیرێک لەیاوەرانی پێغمبەری خودا ﷺ بەگەشتێک دەرچوون ، تالەلای ئاوایەکی عەرەب لایان دا ، ویستیان ببنە میوانیان ، بەڵام ئاوای ڕەزەمەندییان نەنواند ، پاشان سەرۆک ئەو ئاواییە مار پێوەی دا ، زۆر هەوڵیان دا بۆیان چارەسەر نەکرا. یەکێکیان ووتی : بابچینە لای ئەو پێرەی کەلەتەنیشت ئاوایەکەمان لایان داوە ، بەڵکو شتێکیان پێبێت ، پاشان هاتن بۆلایان ، ووتیان ئەی خەڵکینە سەرگەورەکەمان مار پێوەی داوە و بۆمان چارەسەر ناکرێت ، ئایا کەستان چارەسەرێکی لایە، یەکێک لەپێرە ووتی : بەڵێ بەخودا من روقیەدەکەم ، بەڵام واللە چونکە ئێوەڕازی نەبوون میوانداریمان بکەن منیش بەبێ بەرمبەر کارتان بۆناکەم ، پاشان ڕێکەو تن لەسەر برێک لەمەڕیان بدەنێ وەک بەرامبەر بەوکارە. پاشان هەستاو ڕۆیشت لەگەڵیاندا.

لەسەر برینەکە تفی کردو " الحمد لله رب العالمين " واتە سورەتی فاتیحەی دەخوێند ، ڕاستە وخۆ سەرگەورەکەیان چاك بۆوەو دەستی کرد بە ڕۆویشتن وەك بڵێ ی زور گورج و گۆڵانە کەهیچی نەبوبێ . دواتر ئەوانیش ئەو بڕە مەڕەی لەسەری ڕێکەوتبوون پێیاندا ، کە گەڕایەوە ناوبرادەرەکانی ، یەکێك ووت : با دابەشی بکەین، بەڵام ئەو کەسەی ڕوقیەکەی خوێند. ووتی : نەخێر ئەم ڕوداوە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەگێرینەوە، تا بزانین فەرمانێک دەدات . کەهاتنەوە لای پێغەمبەر باسەکەیان بۆ گێڕایەوە. پێغمبەر ﷺ فەرموو چۆن دەزانیت ئەوە ڕوقیەیە؟ پاشان ووتی " بەڕاستی پێکات دابەشی بکەن، وە وەک خۆتان بەشێکیش بۆمن دابنێن " بەم شێوەیە ئەم دەرمانەکاری کرد سەر ئەو دەردو چارەسەری کرد هەروەکو بڵێ ی توشی هیچ نەبووبێ وەئەمە ئاسانترین چارەسەر ، جائەگەر خەڵکی بزانن چارەسەر کردن بە " فاتحە " بکەن ئەوکاتە هەست بەهێز و کاریگەری یەکەی دەکەن. وەمن خۆم بۆماوەیەکی زۆر لەشاری مەککە بووم هەرچی یەکم تووش بهاتایە بەسورەتی " فاتحە" خۆم چارەسەر دەکرد . چونکە هیچ پزیشکێکم نەدەبینی لەو شارەدا ، تەنانەت هەرکەسێکیش توشی ئازارێکیش بهاتایە ڕێنمایم دەکرد کە" فاتحە " چارەسەری خۆی بکات ، کە زۆربەیان زۆر بەخێرایی چاك دەبوونەوە. وەرگیراوە لە کتێبی [ الداء و الدواء ] ئەم فەرموودەیە بخاری " گێڕاویەتی لەکتێبی ( الاجارة) لەبەشی " باب

مايعطي  في الرقية بەژمارە ( ٢٢٧٦ ) وە لەچەند شوێنێکی تریش هێناویەتی ، تەماشای شەرحی ئەم فەرموودەیە بکەلە ( فتح الباري ٤ / ٥٣٢_٥٣٥ )

❁هەموو شتێک گەورە و شەرەفی هەیە گەورەی هەموو قورئانیش سورەتی البقرەیە هەروەها گەورەترین ئایەتی تێدایە کە دەتپارێزێ لە شەیتان و دەباتە بەهەشت کە لەدوای نوێژە فەرزەکان ئایە الکرسی بخوێنی  لەناو ئەم سورەتە باسی هەموو حوکمەکان  و مافەکان کراوە وەکو: حوکمی تەڵاق، حوکمی ریبا، حوکمی نوێژ، حوکمی ڕۆژوو، تەرکردنی مەشروب. ئەگەر سورەتی البقرە بەتەنیا دابەزیبا  و کارمان پێکردبا کیفایەت بوو و ناوەکانی خوای گەورەی زۆر تێدایە. چیرۆکەکانی پێغەمبەران و چیرۆکی بەنی ئیسرائیل، دوعای پێغەمبەر محمد کە شای هەموو زیکرەکانە هەروەها و باسی ابراهیم و اسماعیلی تێدایە وە باسی لێخۆشبون و ڕەحم و بەزەیی خوای میهرەبانی  تێدایە و دەسەڵاتی خوا ئەبینین کە بەچەند پیتێ ئەم کتێبە پیرۆزەی داناوە ڕێنمای تێدایە کاتێ توشی ناخۆشی و سەختی ئەبی کە قەدەری خوایە و هەروها باس لە پاداشتی ئارامگران دەکات. هەروەها دوو ئایەتی کۆتای سورەتی بەقەرە کە شەو بیخوێنیت  وەکو ئەوەیە هەموو شەوەکە شەونوێژت

کردبێ **چیرۆکی دابەزینی ئەو دوو ئایەتە:** جبریل جارێک هات بۆلای پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) وەستا فەرمووی بوەستە ئەی محمد هەست ڕاگرە فەرمووی لەپڕا یەک دەنگی گەورە هات فەرمووی ئاگاداربە ئەوە دەرگایەکە لە دەرگاکانی ئاسمان ئەمە یەکەمجارە بکرێتەوە لەوەتەی ئەرز و ئاسمان دروست کراوە فەرمووی مەلائیکەیەک دابەزیە سەر ئەرز جبریل فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا گوێبگرە لەو مەلائیکەیە چونکە ئەم مەلائیکەیە لەوەتەی ئەرز و ئاسمان دروست کراوە ئەمە یەکەمجارە پێ بخاتە سەر زەوی بزانە چی پەیامێکی تایبەتی پێیە ئەفەرموێ سەلامی کرد منیش جوابی سەلامەکەیم دایەوە فەرمووی مژدەت لێبێ بە دوو نور کە بەهیچ پێغەمبەرێک بە پێغەمبەرانی خودا نەدراوە ئەویش سورەتی الفاتحة و دوو ئاخری ئایەتی سورەتی البقرةیە پێغەمبەری ئازیز عليه الصلاه والسلام دەفەرمووێ خودای گەورە نوسراوێکی نوسیوە پێش دروست بونی ئەرز و ئاسمانەکان بە دوو هەزار ساڵ و ئەو نوسراوەش لای عەڕش لای خۆیەتی لەو نوسراوەی خۆیدا دوو ئایەتی دابەزاندوە کردوەیەتیە کۆتایی سوورەتی البقرة گەر ئەو دوو ئایەتە لە ماڵدا بخوێندرێت تا سێ شەو شەیطان نایەت بەو ماڵەیا ، بە لەفظی دوەم لەفظەکەی ئیمامی حاکم کە صحیحە ئەفەرموێ گەر لە ماڵەوە بخوێندرێت لە هەر ماڵێکدا ئەو دوو ئایەتە بخوێندرێت سێ دانە شەو و ڕۆژەکەی شەیطان ناتوانێ نزیکی ئەو ماڵە بێتەوە ئەی ئەگەر

هەموو سورەتی البقرە بخوێندرێت ئەوە هەر ڕائەکات، بۆیە پێغەمبەر صل الله عليه وسلم ئەفەرموێ گەر ئەو دوو ئایەتە لە شەوێکدا ئینسان بیخوێنی ترسی هیچ شتێی نەبێت نەلە جن نەلە ئنس نەلە هیچ دەعباو جڕوجانەوەر و زەرەر و زیانێک پێغەمبەری ئازیز صلی الله عيه وسلم لە حەدیثەکەی ئیمامی احمد و إبنو حيبان كە صحيحە فەرموێ : ئەو دوو ئایەتی ئاخری سورەتی البقرە لە ژێر گەنجینەی ژێر عەرشی خوایە خوای گەورە هەڵی بژاردوە ئەم سیلاحەی یاوە بەمن کە دەتەوێ لە چاوەزار و سحر و کێشە و ئاژاوە بەدووربیت سورەتی البقرە بخوێنە. ئەو کەسانەی بەردەوامن لەسەر خوێندنەوەی سورەتی البقرە موعجیزەکانی ژیانی ئەبینێت و هەستی پێ ئەکات، لە جەستەدا شیفاء، لە ڕزق و ڕۆزییدا زۆر بوون، لەدڵ و سینگدا ئاسوودەیی، لە تەمەنیا بەرەکەت، لە دەوروبەر خۆشەویستی، لە قیامەتدا ڕازی بوونی خوای گەورە.

❁سورەتی البقرە شتێکت بۆ دەگۆڕێت موعجیزەی خودایە بەکورتی دەرمانە بۆ زیاتر لە هەزار نەخۆشی ئەوە هێزی تۆیە کە دوای لاوازی و شکست هەستی پێدەکەیت .. ئەو دەسەڵاتەیە کە هەموو شتێک لەناو دەبات جنۆکە کە ڕۆحت و ژیانت لەناو برد، ئەو هێزەیە کە دەتپارێزێت

لە زیانی جنۆکەکانی جنۆکە و مرۆڤەکان، ئەو هێزەی کە لەناو دەچوو هەموو جادووگەرێک ڕەنگە ناچاری بکات. هێز و پاراستنت بۆ جەستە و ڕۆح و ڕۆژت دەبەخشێت. هەموو ڕۆژێک سورەتی البقره بخوێنەرەوە بۆ پاککردنەوەی ڕۆژەکانت و بەختەوەر کردنیان. سورەتی بەقەرە لە دێڕەکانیدا نهێنیگەلێکی گەورە هەڵدەگرێت کە هێشتا نەماندۆزیوەتەوە، بەڵام دەتوانین هەستی پێبکەین و دەستیان لێبدەین کاتێک دووبارە و سێبارە دەیخوێنینەوە، کاروباری سەختت لە ژیانتدا ئاسان دەکات، خەونێک بهێنە کە دوور بوو ، و بە دەستی خۆت ڕزق و ڕۆزی خۆت لە ئاسمان بکە، إن شاء الله و بەخشندەی ئەو. و/ القارئ شيخ ماهر المعقلی

❁هەرگیز نائومێد مەبەوە بزانە ئەم ناخۆشیەیی ئێستا هەتە ئەمە تاقی کردنەوەیەکە لەلایەن خوداوە بۆ ئەوەی دەرکەوێت کە ئایا ئارام دەگری یاخود نا  بۆیە ئارام بگرە وچاوەڕێی پاداشت بە لای خودا.

ئارامگران پاداشتیان بێ ژمارەیە

**(إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ)** سورەتی الزمر : ١٠

تەنها ئارامگران ئەجرو پاداشتی خۆیان وەرئەگرن بەبێ ژمارە ، واتە: ئەجرو پاداشتێکی یەکجار زۆر لە بەهەشتدا .

❁له شێخ جونەیدی بەغدادیان پرسی ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت)

ئایا بەڵاو موسیبەت تۆڵەی خواییە یاخود کەفارەتی گوناهە یاخود بەرزبوونەوەو پلەو مەقامە ؟

ئیمامی جونەید فەرمووی : ئەگەر بە بەڵاکە عاجزو تورە بوویت ئەوە سزایە . ئەگەر سەبرت گرت ئەوە کەفارەتی گوناهە . ئەگەر ڕازی بوویت ئەوە بەرز بونەوەی پلەو مەقامی تۆیە لە لای خوای تعالی.

## {پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی هەموو دەردێك دەرمانی هەیە}

١٣٩٧ـ عَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: **(لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ، فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ، بَرَأَ بِإِذْنِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ)**.

واتە : لە (جابر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی: (هەموو دەردێك دەرمانی هەیە، هەرکات دەرمانی ئەو دەردە دۆزرایەوە چاك دەبێتەوە بەئیزنی خوای گەورە).

# {فەزڵ و گەورەیی سورەتی (البقرة)}

❁شەیتان لەو ماڵە ڕادەکات کە سوڕەتی (الْبَقَرَة)ی تێدا بخوێندرێت

لە (أَبو هُرَيْرَة)ەوە رضي الله عنه پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت

**(لا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْفِرُ مِنَ الْبَيْتِ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ)**

واتە: ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان

واتە: عیبادەتی تێدا بکەن و زیکر و قورئانی تێدا بخوێنن " وە بەڕاستی شەیتان لەو ماڵە ڕادەکات، کە سوڕەتی (الْبَقَرَة)ی تێدا دەخوێندرێت

❁لە ڕیوایەتي (عبداللە)ی کوڕی (مسعود)دا رضي الله عنه هاتووە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی

**(اقْرَءُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ فِي بُيُوتِكُمْ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَدْخُلُ بَيْتًا يُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ)** واتە: سورەتی (الْبَقَرَة) لە ماڵەکانتانا بخوێنن، چونکە بەڕاستی شەیتان ناچێتە ماڵێکەوە، کە سورەتی (الْبَقَرَة)ی تێدا خوێندرابێت

❁ئەم سوڕەتە مەزنە ئەو ناوەی خوای پەروەردگاری تێدایە، کە ئەگەر بەو ناوەوە داوا لە خوای گەورە بکەین، وەڵامی دوعا و داواکانمان ئەداتەوە. بەڵگەشمان فەرمودەکەی (أَبو أُمَامَةَ)یە رضي الله عنه کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی

**(إِسْمُ اللَّهِ الْأَعْظَمُ الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ فِي ثَلاثِ سُوَرٍ مِنَ الْقُرْآنِ، فِي الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ وَطَهَ)**

واتە: ئەو ناوە زۆر گەورەی خوای پەوەردگار، کە ئەگەر داوای لێ بکرێت بەو ناوەوە ئەوا وەڵامی داواکردنەکە دەداتەوە، لە سێ سوڕەتی قورئاندا هەیە، سورەتەکانی (الْبَقَرَة) و (آلِ عِمْرَان) و (طَهَ) ناوەکەش بریتییە لە (الْحَيُّ الْقَيُّوم) پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە درەوشاوە ناوی بردووە و وەصفی کردووە

❁أَبُو أُمَامَةَی (الْبَاهِلِي)ی فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو صلى الله عليه وسلم. دەفەرمووێت: **اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ الْبَقَرَةَ وَسُورَةَ آلِ عِمْرَانَ، فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ، تُحَاجَّانِ عَنْ أَصْحَابِهِمَا. اقْرَؤُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ، وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلاَ تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ**

واتە: دوو درەوشاوەکە بخوێننەوە، کە بریتین لەسورەتی (البَقَرَة)، وە سورەتی (آلِ عِمْرَان)، بێگومان لەڕۆژی قیامەتدا دێن وەك دوو پەڵە هەور یان وەك هاوشێوەی دوو پۆل باڵندەی چڕوپڕ، ئەو دوو سورەتە بۆ هاوەڵەکانیان دەبنە بەربەستێك بۆ دۆزەخ، جا سورەتی (البَقَرَة) بخوێننەوە چونکە بەڕاستی خوێندنەوەی بەرەکەتە و وازلێهێنانیشی پەشیمانی و خەفەتە، هەروەها شەیتانەکانیش توانایی ئەم سورەتەیان نیە.

❁ **(( لَا تَجعَلُوا بُيُوتَكُم مَقَابِر ، فَإِن الشَيطان يَنفَرُ مِن الذي تُقرَأُ فِيهِ سورةُ البقرة ))** صحيح مسلم. حديث/ ١٣٤٠.

واتە: نەکەن ماڵەکانتان وەک گۆڕستان لێ بکەن،و قورئانی تێدا نەخوێنن بە تایبەتی سورەتی ( بەقەرە )، جونکە هەر ماڵێک سورەتی ( بەقەرەی ) تێدا بخوێنرێ شەیطان بە پەلە لێی هەڵدێ و لەو جێگایە ناوەستێ.

**(( إقْرَأُ واسورة البقرة، فَإِنَّ أخذَها بَرَكَةٌ، و تَركَها حَسْرَةٌ، ولا يستطيعها البَطَةَ ))** صحيح مسلم، حديث /١٣٧٨.

واتە: هەمیشە سورەتی ( بەقەرە ) بخوێنن، جونکە خوێندنی ئەو سورەتە مایەی فەڕو پیتە، وازهێنانیشی مایەی پەشیمانی و داخ وحەسرەت و خەفەتە، وە هەرگیز جادوو بازەکانیش دەرەقەتی ئەو جێگایە نایەن و پێی ناوێرن کە ئەوەی تێدا خوێنراوە پێغەمبەر ( صل الله علیه وسلم ) کاتێ

که کۆمەڵێکی نارد بۆ ئەنجامدانی کارێک، ئەو کەسانەی کردە سەرکردە و بەرپرسیار، کە سورەتی ( بەقەرە )ـی لەبەر بوو، پاشان پێی فەرموو (( **إِذهَب فَأَنْتَ أَمِيرُهُم** )) واتە: دەسا بچۆو تۆ ڕابەر و ئەمیریان بە. اخرجه الترمذي في سننه.٢٨٧٦ ، وابن خزيمة في صحيحة ١٥٠٩ من حديث أبي هريرة



## {سودە کانی سوڕەتی البقرة}

سورەتی البقرە ٤٩ پەڕەیە، هەرپەڕەیەک١٥دێڕە هەمووشمان ئەزانین وهەرپیتێک لەقورئانی پیرۆز دە چاکەی بۆ ئەنوسرێ...

وریا بە هەرپیتێک جا ئیتر ئەوە وشە بزانم چەنەکا...کەواتە ئەوەی ئەم سورەتە بخوێنێتەوە داهاتوو پاشەکەوتێ خەیاڵی دەستەکەوێت لەتەرازوی چاکەکانی.

- لە گەورەترین و ئەوشتانەی کەبەندە بەهۆیەوە خێر ڕووی لێ ئەکا دوای ئەوەی کە دوعاکەی تەواوکرد خوێندنی سورەتی بەقەرەیە.
- خوێندنی سورەتی البقرە بە ڕێکی و بە بەرنامە و یەقین ئاواتەکانت بۆ بەدی دێنێ.
- سورەتی البقرە هەموو بیرو ترس و چیای خەمۆکی و دڵتەنگی لە دەروونی مرۆڤەکان ئەڕوخێنێ.
- قورئانی پیرۆز هەمووی بەرەکەتە سورەتی بەقەرەش گەورەی بەرەکەتەکانە.
- سورەتی البقرە شیفایە بۆ نەخۆشیەک کە ڕەنگە تۆ هەر نەتزانیبێ ئەو نەخۆشیەت لەناخایا.
- بەخوێندنی سورەتی البقرە خێرو بەرەکەت و ڕۆزیەک ڕووت لێ دەکا کە تۆ بەخەیاڵیش بیرت لێ نەکردبوەوە.

- خوێندنی سورەتی البقره  ئارامی و سوکنایی ئەبەخشی بە دەروون لە خەمۆکی و دوودڵی و ڕاڕایی ڕزگارت دەکا
- هەربۆیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەفەرموێ : **سورة البقرة اخذها بركه وتركها حسرة ولايستطيعها البطله(يعني السحرة)**

واتە : سورەتی البقره  دەست پێوە گرتنی و بەردەوامبوون لەسەری بەرەکەتە بۆ دەروون و ڕزق و ڕۆزی و شفای  نەخۆشیەکانت، و وازلێهێنان و دەستبەرداربونیشی ئەبێتە حەسرەت لەدڵی مرۆڤا،و سحیر بازیش توانای بەسەریا نیە. گەرباسی سیحرو  جادو و چاو نەفەس و حەسەدیان بۆکردی پێیان بڵێ سوربن لەسەر خوێندنەوەی بەقەرە کە ڕوخێنەری خەم و سەرشۆڕکەری شەیتان و جنەکانە.

هیچ سییحرێک ناتوانێ تاسەر خۆی بگرێت بەرامبەر سورەتی البقره

- خوێندنی سورەتی البقره  ڕۆژانە ئەبێتە قەڵایەک بۆ پاراستنت لەچاو و نەفەس و پلانی ناحەزانت
- هەڵەنیت گەر سورەتی البقره  بخوێنی و پاشان داوای خێر و ڕزق و ڕۆزی و منالّی سالّح و زواجبكەی لەخوا،چونكە پێغەمبەر عليه سەڵات و سەلام فەرمویەتی دەستپێوە گرتنی ئەم سورەتە بەرەکەتە بۆ ئەو کەسانەی  ئەیانەوێ بیخوێنن و تاوەکو بەڕەکەت و خێرو پاکی ڕوو لە دڵ  و دەروون و خێزانەکەت بکا...

دەبيت بۆ ماوەيك لە سە رى بە ردە وام بى  هەموو ڕۆژى بيخوێنى سوربە لەسەر ئەوەى نەيخەيتە ڕۆژەكەيتر بەڵكو لەو ڕۆژەيا تەواوى بكەى

❁براو خووشكى موسڵمانم بزانن خوێندنى سورەتى (البقرة) لەماڵەكاندا، يان گوێ لێگرتنى وادەكات شەيتان لەو ماڵە ڕابكات كە سورەتى بەقەرەى تێدا دەخوێندرێت. هەر وەكو پەيامبەرى خوا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: ماڵەكانتان مەكەن بە گۆڕستان، چونكە شەيتان ڕادەكات لەو ماڵەى سورەتى بەقەرەى تێدا دەخوێندرێت . كەواتە گۆڕستان قورئانى تێدا ناخوێنرێت، فەرمودەكەش زۆر ڕوون وئاشكرايە،

❁ئەم سوڕەتە خواى گەورە تايبەت مەنديەكى ترى پێ بەخشيە ئەويش ئەوەيە ئەگەر سيحر نەدۆزرێتەوە لەهەر شوێنێک حەشار درابێ وەک مس لەشوێنى خۆى ئەتوێتوە سوڕەتى البقره بە سوڕەتى موعجيزە ناوبانگى دەركردوە  پێغەمبەر صل الله عليه وسلم ئەفەرموێ سورة البقرة **( اخذها بركه وتركها حسرة ولايستطيعها البطله (يعني السحرة)**

واتە : سورەتى البقره  دەست پێوە گرتنى و بەردەوامبوون لەسەرى بەرەكەتە بۆ دەروون و ڕزق و ڕۆزى و شيفاى نەخۆشيەكانت، و وازلێهێنان و دەستبەرداربونيشى ئەبێتە حەسرەت لەدڵى مرۆڤ و سيحر بازيش تواناى بەسەردا نيە.

❁ئەم سورەتە ڕوخێنەری خەم و سەرشۆڕکەری شەیتان و جنەکانە هیچ سیحرێک ناتوانێ تاسەر خۆی بگرێت بەرامبەر سورەتی البقره. خوێندنی سورەتی البقره بە ڕێکی و بە بەرنامە و یەقین ئاواتەکانت بۆ بەدی دێنێ.
سورەتی البقره هەموو بیرو ترس و چیای خەمۆکی و دڵتەنگی لە دەروونی مرۆڤەکان ئەروخێنێ سورەتی البقره شیفایە بۆ نەخۆشیەک کە ڕەنگە تۆ هەر نەتزانیبێ ئەو نەخۆشیەت لەناخ دا هەیە خێر و بەرەکەت و ڕۆزیەک ڕووت لێ دەکا کە تۆ بەخەیاڵیش بیرت لێ نەکردبوەوە ئارامی و سوکنایی ئەبەخشی بە دڵ و دەروون لە خەمۆکی و دوودڵی و ڕاڕایی ڕزگارت دەکا.

❁ئەم سورەتە ئەبێتە قەڵایەک بۆ پاراستنت لەچاو و نەفەس و پلانی ناحەزانت گەر سورەتی البقره بخوێنی و پاشان داوای خێر و ڕزق و ڕۆزی و منالی سالح و زواجبکەی لەخوا چونکە پێغەمبەر علیه سەلات و سەلام فەرمویەتی دەستپێوە گرتنی ئەم سورەتە بەرەکەتە هەوڵ دە هەموو ڕۆژی بیخوێنە نەیخەیتە ڕۆژەکەی تر بەڵکو لەو ڕۆژەدا

تەواوی بکە ئەگەر بەجارێک پێت تەواو نەکرا دەتوانی لە سێ کات لەماوەی ٢٤ کاتژمێر بە سێ بەش بیخوێنی

وەرگیراوە لەلایان : باوکی عبدالله وعبدالرحمن

## " چیرۆکەکان "

سورەتی بەقەڕە هیوایە بۆبێ هیواکان،دڵە شکاوەکان چاک ئەکاتەوە ئەوەی نەی خوێنێت نازانێ چی هەستێکی هەیە خۆراکی ڕۆحەئارامی دڵ و دەرونە کلیلی کردنەوەی ناڕەحەتیەکانە



# {چیرۆکی یەکەم}

السلام علیکم ورحمته الله. سەرەتا دەکرێ بڵێم سورەتی البقره تەواوی ژیانمی گۆڕی لەنەخۆشی و ئازارێکی زۆردا بووم دەستم کرد بە خوێندنی سورەتی البقره چەند مانگێک بەردەوام بووم تا دەهات حاڵم خراپتر دەبوو گوایە من سحرم لێ کراوە سوێن بەخوا سێ چوار جار لەخەوم بینی پێیان وتم سحرەکەت بەتاڵ بۆتەوە وە هەروەها دایکیشم لەخەوی بینی وتی پێیان وتم سیمکارتی مۆبم بشکێنم چونکە سحر لەو کراوە ئیتر کە شکاندم کۆتا خەونم ئەوە بوو لەخەوا ڕشامەوەو پێیان وتم شکور سحرەکەت لەسەر نەما ،،، وە بەهۆی سورەتی البقره خوای گەورە هاوسەرێکی پاک و لەخواترسی پێ بەخشیم الحمدلله یانی چەندەها ساڵە دەیخوێنم هەرچی شتی ژیانم و ناخۆشی ژیانمە نەمماوە کەناشی خوێنم دڵم زۆر توند دەبێ و ئەگریم مەگەر مەجال نەبێ دەنا شکور هەموو کات دەیخوێنم بۆیە بێ هیوا مەبن دائیم دەست بگرن بەدوعاو پاڕانەو و خوێندنی قورئان بەگشتی چونکە بەڕاستی تاکە چارەسەر و شیفا قورئانەو دەستی پێوە بگرە دڵنیام قەت پەشیمان نابیتەوە .لەکۆتاییدا الحمدلله علی نعمه الإسلام



## {چیرۆکی دووەم}

ته مه نم ٢٤ ساله له خێزانێكی هه ژار و خوا ناس بووم به هۆی خراپی بارودۆخه وه هاوسه رگیریم له گه ل ناسیاوكی خۆمان كرد دوای ٣ سال ژیان كردن و نه بونی منالٚ هه رچی دكتور بو وتیان هه رگیز ناتوانیت منالٚت بێت و نابیت به دایك ته نانه ت به بلوریش نابوو بۆیه هاوسه ره كه م وتی من هیچ مه جبور نیم یه دیار ژنێكی نەزۆكه وه دانیشم و داوای جیابوونەوەی لێ كردم و جیابوینه وه منیش بێ هیوا نەبووم رووم له ده رگای خوا كرد و ده سم كرده سوره تی البقره و شه و نویز كردن به تاییه ت نوێژی وتر زۆر له خوا پاڕامەوه هه ر به ماوه یه كی كه م خوا كه سێكی زور باشی كرده قسمه تم و هاوسه رگیریمان كرد و دواي ٤ مانگ دووگیان بوم به دوانه یه ك كه كچ و كورن ئێستاش به رده وام له سوره تی البقره چونكه موعجیزەی بۆ خولٚقاندم خوایه گیان زور سوپاس كه به سه رت كردمه وه

**خودا پێتی ئەبەخشێت تا ڕازی ئەبیت پاداشتی ئارامگرتن و چاوەڕوانیت پێ ئەبەخشێت ئاواتەكانت وەكو قەرەبووی ئارامگرتنت ئەداتەوە**

## {چیرۆکی سێیەم}

هاوڕێیکم هەبوو تەمەنی گەورە بوو. وڵاهی زە واج زۆر زۆر قورس بوو لەسەری . هەر چی ئەکرد بوی نە دەبووو رۆژێکان پێمان وتت دەست بکە بە خوێندنی سورت البقرە سوێند بەخوا دە رگا داخراوکان ئە کاتە وە چیت بوێت بەدی دە هینت بۆتت دە ستی کرد بە خوێندنی ماشاءﷲ 40 رۆژێ نەبرد زە واجی کرد. پێت وایە هەرگیز قبوڵ نابێت بەڵام خودا بەدی ئەهێنێت داواکەت.

## {چیرۆکی چوارەم}

بیرمە ڕۆژێک زۆر زۆر دڵتەنگ بووم بێ ئەندازە چوم دەست نوێژێکم گرت بەگریانەوەو لەتاو دڵتەنگی تەنها 17ئایەتم بۆ خوێنرا لەگریانا نەمەتوانی پاشان چومە سوژدەو زۆر زۆر دووعام کرد سوێند بەخوا چەن کاتژمێرێکی پێ چوو ڕێک وەڵام درامەوە

**بەجۆرێک ماندوو ئەبیت کە پێت وایە هەرگیز ڕزگارت نابێت بەڵام نازانیت خودا بەو ماندوو بونەت ڕێگای دەرچوونی بۆ کێشاویت**

# {چیرۆکی پێنجەم}

رووداوێکم بەسەر هات زۆر زۆر حاڵم وێران بوودەسەڵاتم هیچ نەمابووداوای موعیجزەیەکم کرد لەخوا دواتر لەجێیەك بینیم زۆر باسی سورەتی البقرەی تیابوو چەندین فەزل و دەسکەوت وتیان گەر بیخوێنی بۆماوەی هەفتەیەکبەیەقینەوە ئەوەی ئەتەوێ دێتە دی منیش دەستم پێکرد هەفتەیەك خوێندم نەشم توانیایە گوێم لێ ئەگرت نەم ئەهێش ئایەتێك تێپەڕێ بێ ئەوەی دلم لای نەبێ.

بزەبت پاش هەفتەیەك ئەوەی ویستم بوو تەنیا یەك هەفتەئیتر لەوکاتەوە الحمدلله نەمتونایەوە وازی لێبێنم ڕەحمەت و بەرەکەتی تەواو نابێت پێغەمبەر خوا صل الله علیه وسلم ئەفەرموێ خوێندن و دەسپێوەگرتبی رەحمەتە و وازلێ هێنانیشی حەسرەتە بەراستی رێك بەو جۆرەیە

**پێت وایە ئەوەی ئەتەوێ هەرگیز ڕوونادات بەڵام لەوپەڕی بێ ئومێدی و نائومێدیت موعجیزەیەک دێ کە ئەو فرمێسکانەی توانات نەبوو بۆ ئازارەکانت دەرییبڕی لەخۆشی گیرابونی دوعاکانت دێنە خوار**

## {چیرۆکی شەشەم}

من کچێکم تەمەنم 45سال بوو سحرم لێ کرا لەلایەن نزیکترین کەس خوێندەواریم نەبوو شەوانە زۆر دەترسام لەدوای نوێژی عیشا نەم دەتوانی بەتەنها لەژووری بێمە دەرێ زۆر دەترسام هەستام بەلێدانی سورەتی البقرە بەهیدفۆن بۆماوەی چوار مانگ ڕۆژێکیان ڕشامەوە ئاوێکی زەردم هیناوە ڕەنگم زۆر تێک چوو لەماوەی ئەوبەکارهێنانەی سورەی البقرە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەستم دەکرد دڵم خۆشە ئەبوو ئێستا شووم کردیە و لەمالی خۆمم ئەوبەرەکەتی سورەتی البقرە. ئەی ئەوانەی شتێکتان لەدەست چووە دڵنیابن خوا قەرەبوەکانی سەرسورهێنەرە. ئەمەوێت لەم چیرۆکەی خۆمەوە پێتان بڵێم خوای گەورە خۆی زانایە بەهەموو شتێک خۆی ئەزانێت ئێمە قابیلی چین

## {چیرۆکی حەوتەم}

من پەیوەندیم لەگەڵ کوڕێکا هەبوو هەردووکمان زۆر زۆر یەکمان خۆشئەویست ئەزانم حەرامە بەڵام ئێمە بەمەبەستی زەواج قسەمان ئەکرد لەم گروپەوە ئەمبینی کە سوڕەتی البقرە و سەڵاواتی ئیبراهیمی و لاحول ولاقوة الا باللە چەن گەورەیە ئاواتەکانت پێی یەتە دی لە مانگی ڕەمەزانەوە دەستم پێکرد بەپێی توانا ئەم خوێند مانگێکی نەبرد ئەو کوڕەی کە خۆشمئەویست ژنی مارەکرد زۆرزۆر دڵ تەنگ و

نائومێدبووم چەنەها شەو خەوم لێنەئەکەوت ڕۆژ و شەوم ببوو بەگریان.

ئەو کوڕە ئەی وت باوکم بەزۆر ژنی پێ هێناوم منیش هەر وازم لەدوعاکردن و پاڕانەوە سەڵاوات و لاحول ولاقوة الا بالله و سوڕەتی البقرە نەهێنا لەپەروەردگارم ئەزانم دەستم بۆ حەرام بردووە بەڵام جگە لەخوای گەورە کەسی ترم نیە هەر دوعام ئەکرد من و ئەو کوڕە ببین بەحەڵاڵی یەک دەنگم گەشتە لای پەروەردگارم دوعاکەم گیرابوو بەڵام بەقازانجی من لەم ڕۆژانەیا لەڕێی کەسێکی نزیکی ئەو کوڕەوە بۆم دەرکەوت کە ئەو کوڕە جگەرەکێشە و ڕەزیلە چەنەها درۆی لەگەڵ من کردووە لەهەمان کاتا من ئێستا داواکارم هاتووە بەدین و ئیمان و ڕێک و پێک خۆ ئەگەر زەواجەکەشم ڕێک نەکەوێت دڵیام کە خوای گەورە باشترینی بۆ من داناوە چونکە خوای گەورە خۆی خۆشەوستانی خۆی لە خراپەکان ئەپارێزێت من دەستم بۆ حەرامبرد بەڵام خوای گەورە هەر تەنهای نەکرد باشترینەکەی بۆ من هەڵبژارد لەکاتێکا من وامئەزانی ئەو کوڕە باشترین کەسی سەر ڕووی ئەم دونیایەیە بەڵام ئێستا ئەڵێم نەک جارێک هەزارجار سپاس بۆ خوای گەورە کە نەبووە قسمەتم من ئێستا ئاسوودەترین دڵ و دەرونم هەیە کە جگە لەخوای گەورە پێویستم بەکەسی تر نیە بۆیە هیچ کاتێک مەڵێ بۆ ئەوەی من ئەمەوێت نایەتە دی دڵنیابە خوای گەورە تۆی خۆشئەوێت و باشی تۆی ئەوێت .

توخوا کچینە ئەمەوێت لێرەوە پێتان بڵێم نەکەونە داوی هیچ کەسێکەوە من خۆم ڕقم لەخۆشەویستی بوو بەڵام هەڵی خەڵەتاندم باوڕبەکەس مەکەن بەخوا درۆیە ئەوەی تۆی خۆشبوویت یەتە داوات و ئەتکات بەحەڵاڵی خۆی کە وتی پارەم نیە باوڕی پێ مەکە بەخوا هەر هەمان کوڕ دوای کچێکی تر ئەهێنێت و پارەشی پێیە ئەگەر پێشی نەبێت قەرزی بۆ ئەکات ئەگەر تۆی خۆشبوێت هەموو شتێک ئەکات خۆشەویستی واتە دوای زەواج . لەکۆتاییا ئەمەوێت بڵێم زیکر و یادی خودا مەکە تەنها بۆ گەیشتن بەئاواتەکەت بیکە بۆ ئەوەی لەخالق نزیک بیتەوە خودا باشترینمان بۆ ئەهێنێتە ڕێگامان .

سوڕەتی بەقەرە مردووی زیندوو کردەوە نهێنیەکی گەورەی کەشف کرد ، یەتیمێکی دەوڵەمەند کرد ،دەرسێکی گەورەیە بۆ ئەوکەسانەی عیبادەتی خوای گەورە دەکەن... وە ساحیرەکانی کەشف کرد.. سوڕەتی بەقەرە بخوێنن بەڵکوو تەواوی دەرگا داخراوەکان بە رووتاندا بکرێتەوە چونکە پێغەمبەر گیان ﷺ خۆی فەرموویەتی ئەوەی دەستی پێوە بگرێت دەبێتە بەرەکەت بۆی و ئەوەی وازی لێبهێنێت دەبێتە حەسرەت لە ژیانی

..

# {چیرۆکی هەشتەم}

موعجیزەی خوێندنی سورەتی البقرە ڕۆژانە، من توشی نیگەرانی و فەقیری و گۆشەگیری ببوم الحمدلله کە ڕێنوێنی کردم بۆ خوێندنی سورەتی البقرە ڕۆژانە بە بێ بچڕان، بە کەمتر لە ٤ مانگ ئیشێکی وام دەست کەوت کە خەونم بوو وە بە پلەو پارەیەکی وا کە زۆر مەحاڵ بو بێ، سەراری ئەو هەمو نیعمەتە هەرچی نیگەرانی و ترس و گۆشەگیری و فەقیریم هەبو کۆتای هات و خودا شیفای بۆ ناردم الحمدلله بۆیە بڕیارم داوە هەرگیز دەستبەرداری ئەم سورەتە گەورەیە نەبم بە بەردەوامی خوێندنەوەی سورەتی البقرە،بەندە ڕادەکێشێت بۆ ئەو خێرو بەرەکەتەی کە بە خەیاڵی دانایەت وە بەندە لادەدات لەو شەڕو فیتنەیەی کە هەستی پێ ناکاکات ک بۆ یەکەمجار دەست دەکەیت بە خوێندنەوەی سورەتی بەقەرە، هەست بە نامۆیی دەکەیت لەناختدا، وەک ئەوەی نەتەوێت بیخوێنیتەوە....بەڵام بە پێداگری لەسەر خوێندنەوەی تەواوەتی ڕۆژانە جارێک...سەرسوڕهێنەر و نیعمەتەکان بدۆزەرەوە شتێک کە وەسف ناکرێت...و گۆڕانکاری بەرچاو دەدۆزیتەوە لە ماڵەکەتدا، لە ژیانتدا، لە تەندروستیتدا، لە کارەکەتدا، و لە هەموو کاروبارەکانتدا گۆڕانکارییەکان کە شکست دەهێنن لە مێشکت .

## {چیرۆکی نۆیەم}

چیرۆکی من لەگەڵ سورەتی البقرە لە ناکاو هەندێ نیشانەی سەختی میز کردنم هەبوو خراپ تر بووم ماوەێ ساڵیک لە خەستەخانە بووم هەموو خەستەخانەکان دەیان گووت باشە عەیبی نیە منیش زور ماندوو بووم لەم کێشەیە بۆیە بریارم دا دەست بکەم بە خوێندنەوەی سورەتی البقرە ماوەێ 20 ڕۆژ سورەتی البقرەم دەخویند الحمدلله نەشتەرگەریان بووم کرد بە سەلامەتی

## {چیرۆکی دەیەم}

سورەتی البقرە خوێندی بەرەکەتەو وازهێنان لێی حەسرەتە، من لەگەڵ منداڵەکەم لە غەریبی دەژیاین منداڵەکەم تەنها یەک مانگ بوو هیچ کەسێکم نەبوو جگە لە برایەکم کە لەگەڵ ژن و منداڵەکانی لە شوێنێک دەمانەوە ٢٠ دەقە لێم دوور بوون هیچ کەسم نەبوو کە ئاگای لێم بێ یان پێداویستیەکانم دابین بکات دەستم کرد بە خوێندنەوەی سورەتی البقرە و شەو نوێژ چەند توانییام دەمخوێندەوە چونکە منداڵێکم هەبوو پێویستی بەوە بوو ئاگام لێی بێ لە شەو نوێژدا دەمخوێندەوە هەموو شتێ لە ژیانم گۆڕا کارەکانم بۆ ئاسان بوون ئەگەر شتی ئاسایش بوایە بەڵام بۆ من زۆر قورس بون هەموویم بۆ ئاسان بوو. سەرەتا هیچ کەسم دەست نەدەکەوت بمبات بۆ دکتۆر لە کاتی خواردن پێدان بە منداڵەکەم دوای دەست پێکردنم

به سورەتی البقرە بەماوەی چەند رۆژێکی کەم دکتۆرەکەم پەیوەندی پێوەکردم کە لەلای ئەو منداڵم بوبوو لە هەواڵی من و منداڵەکەمی پرسی سبحان الله ....پێمگوت منداڵەکەم هیچ ناخوات و کەسم نییە ببیەم بۆ دەرمانخانە پێی گوتم لە دەرمانخانەی خۆی دەتگەیەنن بەبێ بەرامبەر تەنها پەیوەندیان پێوەبکە ئەوان دەتگەیەنن زۆر دڵخۆش بووم ئەو خەمەم زۆر گەورە بوو سوپاس بۆ خوا کە چارە بوو ،،،

دووەمیان کاروبارەکانی گەیشتنم بە پیاوەکەم دەست پێکردو جوابیان دامەوە سوپاس بۆ خوا کە ئەویش چارە بوو من و مێردەکەم ئەوەندە دڵخۆش بووین کە وەسف ناکرێ ئەمانە دوای ئەوەی دەستم کرد بە خوێندنی سورەتی البقرە دوای ساڵێک و نیو جوابیان دامەوە سوپاس بۆ خودای گەورە وە هەندێک ناخۆشیمان هەبوو لەگەڵ خێزانەکەی سبحان الله دوای وایان لێهات قسەکردنیان زۆر لەگەڵم باش ببو ئەوە جگە لەو ئاسودەیی و ئارامیەی کە خۆم هەمبوو بۆ هۆی سورەتی البقرە سوپاس خودایە بۆ هەموو نیعمەتەکانت وگەورەیت. باس بکە م لە سە ر بە رچاو رونی سورە تی البقرە ئە وکات ناتوانین گوزارشت بکە ین لە پی دانی مافی دا . باسی خوم دە کە م کە ژیانم گۆڕا 90 پلە. یە کە م هەندێ شت هەبوون لە نێوان من و ناخم دا دوورم خستەوە لە خۆم کە وام دە زانی خێری تیدایە بۆم بەڵام پێچەوانەکەی بوو، کە دە رد و بەڵا بوو. ژیان بەرتەسک بوو بۆم بەڵام گلە یم لای کە س نە کرد چووم پەرتوکەکەی

خودام خوێند به تایبه ت سوره تی البقره به خودا هەندێ که سم له به رچاو که وت که له خەیاڵم دا هه ربیرم لێ نەکردبوویەوه ، بڕوا بکەن هه رکات ژیان قورس بوو له سه رتان بڕۆن سوره تی البقره به یەقینەوه بخوێنەوه ته واوی بکه ن بروابکه ن ده بینی که ژیانت دەگۆڕێ به ره و باشتربون.

## {چیرۆکی یانزەم}

چیرۆکێکی پڕ ئومێده. الحمدلله 70 ڕۆژی یەک لەدوای یەک سورەتی البقرەم خوێند ، ئەوەش چیرۆکەکەم..

دوای ئەوەی 50 ڕۆژی یەک لەدوای یەک سورەتی البقرەم خوێند ، هەر تووشی ناخۆشی ئەبووم لەژیانما ، چیرۆکی خۆمتان بۆ باس ئەکەم و خۆمتان پێ ئەناسێنم. من کچم و تەمەنم 29 ساڵه ، زۆر ئەخوێنم و ڕوخسارێکی باش و جوانم هەیه ، ساڵی 2018 چووم بۆ بەریتانیا بەمەبەستی خوێندن لەزانکۆی کامبرج ، لەم ساڵانەی دوایدا هەستم به گۆرانکاری کرد لەشێوەمدا ، لەماوەیەکی زۆر کەمدا زۆر قەڵەو بووم و شێوەی دەم و چاویشم زۆر گۆڕا ، تەنانەت زۆرێک لەبرادەرەکانم لەگەڵمدا گۆڕان ، بەڵام من هەر ئەموویست تێکەڵ بمەوه لەگەڵیان بەحوکمی ئەوەی کەسێکی تێکەڵم ، بەڵام سوودی نەبوو ،



تا وام لێهات دوورکەوتمەوە لێیان .پاش تێپەڕبوونی چەند مانگێک پەیوەندی پتەوم لەگەڵ چەند هاوڕێیەک دانا کە هاو زمانی خۆم بوون و زۆرینەشیان ئەورووپی بوون .

لەکۆتاییەکانی ساڵی 2019 ژیانم گۆڕا و براکەم لەدەست دا خوا لێی خۆش بێت ، وام لێهات هیچ گرنگیەکم بە خۆم نەدەدا و هەموو هەفتەیەک توشی ناخۆشیەک ئەبووم ، بۆنموونە لەو ماوەیەدا هەموو ڕۆژ ئەکەوتم و هەرجارە و بەشێک لەجەستەم ئەشکا و بەتەواوی شێوەم تێکچوو ، هەموو کاتیش خەوی ناخۆشم ئەبینی. ساڵی 2020 بحسەکەم پێشکەش کرد و الحمدلله سەرکەوتبووم و گەڕامەوە وڵاتەکەم ، لەگەڵ ئەوەی شەهادەکەم بەرز و باوەڕپێکراوبوو بەڵام کارم دەس نەدەکەوت و لەهیچ شوێنێک وەرنەدەگیرام ، زۆر بێزارو ماندووبووم و توشی خەمۆکی بووم لەگەڵ ئەوەی هەموو کات نوێژەکان و عیبادەتەکانی ترم ئەکرد ،ویستم دووکان بکەمەوە بەڵام نەمتوانی سیقەم بەخۆم لەدەست دابوو .

بۆیە بریارمدا دەسکەم بە خوێندنی سورەتی البقرە و هەموو ڕۆژ بیخوێنم ، الحمدلله هەر پاش خوێندنی نەخۆشیەکی ئافرەتانەم هەبوو چارەسەر بوو الحمدلله ، خەوم بە ماری ڕەشەوە ئەبینی ، یاخود مەخلوقاتی سەیر کە نیوەی بەشەربوون و نیوەکەی تریشی گیاندار بوون ،پاشان خەوم بینی و بۆم دەرکەوت کە نەکردنەوەی دووکانەکەم هۆکاری چاو نەفەس و حسدە واللە اعلم (خەوەکە دورودرێژە) ، ماوەیەک تێپەڕی و هەستم کرد خەڵکی

بەبێ هۆ لێم دا ئەبڕێن ، وە هەستیشم ئەکرد کە هەمووکات کەسێک لەگەڵمایە و کە البقرەم ئەخوێند زیاتر هەستم پێی ئەکرد ، تا گەیشتە ئەوەی ماوەی 30 ڕۆژی ڕێک سورەتی بقرەم خوێند و لەگەلیشیدا بەڕۆژوو ئەبووم ،خەوم بینی لەخەومدا مارێکی سێ سەری ڕەشم بینی و پێم وت پێش ساڵێک لەخەودا بینیتم بچوک بووی ئێستا گەورەتر بووی ، ڕێک هەر سێ سەرەکەیم بڕی ، کە بەخەبەر هاتم زۆر هەستم بە مرتاحی ئەکرد ، بریارمدا دەسکەم بە گرنگیدان بە ڕووخسارم سبحان الله ڕوخسارم پڕ نور بوو و زۆر گەشایەوە ، لەوکاتەوەی دەستم بە خوێندنی سورەتی البقرە کرد خەڵکانێکی زۆر لێم دوورکەوتنەوە ، لەماوەی سێ مانگدا هیچ برادەرێکم هەواڵی نەپرسیم بەهیچ جۆرێ ، هەموو ئەوانە نیعمەتی خوای گەورەن ، ئەمڕۆ 70 ڕۆژی یەک لەدوای یەکە سورەتی

البقرە ئەخوێنم و بیروڕام بۆ ژیان گۆڕاوە و چاوم تەنها نیعمەتەکانی خوای گەورە ئەبینێ و هەست بە خۆشی ژیان ئەکەم سوپاس بۆ خوا ، ئەمەوێ پێشتان بڵێم دەستم کرد بە بنیات نانی دووکانەکەم کە دووکانی شیرینیە و لەمانگی ڕەمەزاندا دەکرێتەوە إن شاءالله ، چونکە من لە بریتانیا بە مەبەستی درووست کردنی شیرینی دەمخوێند و لەوبوارەدا بووم ، الحمدلله علی کل حال.



# {چیرۆکی دوانزە}

من حەزدەکەم تەجروبەی خۆمتان لەگەڵ سورەتی البقرە بڵاوبکەمەوە ماوەی ٥ ساڵ سورەتی البقرەم خوێند شتی سەرسوڕهێنەرم بینی لە ژیانم بە فەزڵی خوای گەورەدواتر بە خوێندنەوەی سورەتەکە. حاڵم ١٨٠ پلە گۆڕا. دکتۆراکەمم تەواو کرد لە تەمەنی٢٧ ساڵی دواتر دامەزرام بە هەمیشەیی لەسەر کارێک. وە لە زانکۆ دامەزرامەوە ئیشەکەم هەموو کەس ئاواتی پێدەخواست ئەو ئیشە خۆی هاتە بەردەستم  بەبێ هیچ واستەیەک واستەی من خودای جیهان بوو. وە پەیوەندیم لەگەڵ مرۆڤەکان بەو جۆرە بوو کە خۆم ئاواتم بوو  هەمیشە بە ئەرێنی دەژیم و دڵخۆشم بیرم ئاسودەیە  هەر پەیوەستم بە خوێندنەوەی لە شەو نوێژ وە سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر د.خ لەسەر بێ وە استغفار. زۆر زۆر شت گۆڕا لە ژیانم زەحمەتە وەسفیان بکەم. لە دڵەوە ئامۆژگاریتان دەکەم  پابەند بن پێوەی بەس پێویستە سەبر بگرن تاوەکو  هەست بە کاریگەریەکەی بکەن لە ژیانتان دا سورەتی موعجیزەکانە



# {چیرۆکی سیانزە}

لەدوای چل ڕۆژ خوێندنی سورەتی البقرە لە جنی عاشق و سیحر ڕزگارمان بوو هەزار سوپاس بۆ خوا..هەر بەردەوام ببوم بە چوار مانگ ئیشم دەست کەوت کەتازەش خوێندنم تەواو کردبوو،هەموو شتێکمان پڕ بەرەکەت ببو،خوازێنی من و خوشکەکانم زۆر زۆر بوو،جگە لەوە شەوێک خەونێکم بینی مامۆستایەک لێکدانەوەی بۆ کردین وەڵاهـ هەفتەیەکی نەبرد خوشکێکم هاوسەرگیری کرد وەک چۆن مامۆستاکە لێکدانەوەکەی کرد، کارەکانمان ئاسان بوە سوپاس بۆ خوا، حەز بەهەر شتێک بکەم نزای هەر شتێک بکەم خێرا قبوڵ ئەبێ، وەبەردەوامیش ئەبم تا خوای گەورە عومری ئامانەتم لێ ئەسەنێت، لەگەڵ سورەتی البقرەش هەموو ڕۆژێک هەزار سەڵاوات و هەزار لاحول ولا قوە الاباللە وزیاتر لە دوو هەزار استغفراللەم کردوەو هەموو زیکرەکانی کەش سەت دانە..

چاوەڕێی شتی زۆر گەورەشم لە ژیانم ڕوبا بەئیزنی خوا، یاخوا نەخشە بێ لە هەمووتان بەئاواتان بگەن و بەردەوام بن لە یادی خواو دەستی پێوە بگرن و موعجیزەی ئەبینن

## {چیرۆکی چواردە}

من ماوەی ٣ساڵەعیلاجی خۆم دەکرد بۆ مندا ڵ ئەو ماوەی هەر خەریک بووم زۆۆۆر هاتووچۆی دکتۆرم دەکر کە عیلاجم بەکار هێنا بۆ ماوەی هەفتەک زیاتر هەموو رۆژێ سوره البقرەم دەخوێند، ئێستا سوپاس بۆ خواخوای گەورە پێی بەخشیم،هەرگیز لە ئومێدی خودا بێ ئومێد مەبن بەراستی سوره البقرة خێر و بەرەکەتە.

## {چیرۆکی پازدە}

من لەو کاتەی خۆم ناسی بەدەست کیشەک ئازارم دەچیشت کە بەهۆی هەڵەکەوە تووشم بوو بەس خەمم دەخوارد بەس دەگریام چونکە پێم وابوو چارەسەری نیە لە ١٦ ساڵی تا ٢٨ ساڵی من ژیانم نەبوو بیرم دەکردوە خۆم بکوژم یان هەروا بژیم بەدەسی ئەو کێشەوە بەردوام دوعام دەکرد خوایە چی بکەم کێشەکەم چاری نییە دەگریام دەم وت من بۆ بخوینم هەر دەمرم خۆ تۆش نەخۆشی نەفسی بووم تا رۆژیک لە گروپێک وتیان سورتی البقره بخوێنە رۆژانە چی داوا بکەی دێتە دی و الله ئەمنیش دەستم پێ کرد رۆژی بەپێی توانا دەمخوێند بەدڵ دوعام دەکرد ولا مانگێ کی برد و نەبرد کێشەکەم حەل بوو بروا بکەن لە خۆشیا فرمیسکم رشت سوجدی سوپاسگوزاریم برد بۆیە دەڵێم سورتی البقره بکەنە هاوڕێی

هەمیشەتان. من زۆور دەمێ کە ئەیخوێنم. هەرچەند ئێستا بەئاواتەکەم نەگەیشتوم ئاواتەکەم زۆر سەختە بەڵام دڵنیام خودا نائومێدم ناکات . بەڵام لەم کاتەوەی دەستم کردوە بەخوێندنی. زۆور دڵو دەرونم ئارامە هەستێکی زۆر تایبەتی هەیە کەڕۆژێک نەیخوێنی هەست دەکەی شتێکت لێ ون بووە ناتوانی دەستبەرداری بی تکایە دەست بکەن بەخوێندنی تالەو نیحمەتەبێبەش نەبن. لە کاتێکدا دڵخۆشیت بۆ دێت کە تۆ مەزەندەت نەکردووە بە بێ مەوعید !!..

تەنیا ئەوەی  خودا کردوویەتی بە قەدەرێک تا پاداشتی سەبرگرتنەکەت بداتەوە ..

 دەستی بۆت ڕادەکێشێت تاکو چارەسەرت بکات و  ئاگای لێت بێت ،ئەوەی مەزەندەی بۆ خوا هەر خێر بووە و لێی بە یەقین بووە خوا هەرگیز بێ ئومێدی ناکات. من پێت ئە ڵێم هە تا زوو تر دە ست بکە ی بە خوێندنە وە ی هێشتا کەمە سورە تی موعجیزە سورەتی ئاوادانی دڵ سورەتێک  هە تا دەست پێ نەکە ی نازانی چ هە ستیکی خوشت  بە دە ست پێکردنی ڕۆژێک نە یخوێنی  ئە ڵێ دونیا بە سەردا ڕوخاوە گەر بێ بە  ش بووی لێی چاوەڕی خۆش بە ختی مە کەن بۆیە گەر دە تە وێ

هیوایەک بگە رێتەوە بۆ ناو ئەو دڵە تان ئەوا دەستبگرن بەسورەتی (البقره)من قوربانی دە سە ڵاتی  بێ سنورت بم ئیلاهی.

وە ڵاهی تا خۆت نەیخوێنی لە موعجیزە و بە رە کە تە کە ی تێناگەی الحمدللە من خۆم استیفادە م لێ کردوە و ئامۆژگاریم بۆهە مو کە س ئە وە یە کە ڕۆژانە بیخوینی نازدارمان دە فەرموێت **اخذها برکة وترکها حسرة.** واتە دە ستگرتن پێوەی بە رە کە تە و وازلێهێنانیشی حەسرەت و پەشیمانیە. زۆر کە سیشم بینیوە کە خوێندویانە موعجیزە لە ژیانیاندا ڕوویداوە. من هەموو هەفتەی جارێک دەی خوێنم سبحان الله هەر جارەی بەنیە تی هاتنە دی شتێک دەی خوێنم الحمدللە هەموو شتانەی کەویستومە هاتۆدە دی بۆ شیفای نەخۆشیش خوێندمە سبحان الله شیفای بۆ هاتووە.

## {چیرۆکی شانزە}

### لەسەر سورەتی البقرە کەمێک ئەدوێم

سەرەتا کە باسی گەورەی و پیرۆزی سورەتی البقرەم ئەخوێندەوە ئاواتم ئەخواست منیش ڕۆژێک بێت و ئەو هێزەم هەبێت بیخوێنم ،، چونکە ڕاستی شەیتان زاڵبوو بەسەرمدا ئەموت من ناتوانم زۆر زۆرە کاتم نییە ، لەکاتێکدا چەندین کاتژمێر ئەخەوتم و لەشتی بێ سوود سەرفم ئەکرد لەگەڵ زیاتر سلاواتدان بێ ئاگاداری خۆم گەشتومەتە لوتکە لەگەڵ خودا پاشان بڕیارم دا سوڕەتی البقرە بخوێنم و تەماشای چیرۆکەکانم ئەکرد وتم ئیلا ئەبێت بەیەک ڕۆژ بیخوێنم منیش گەر دەستم لەئاو ئاگر بێت .



پاشان نوێژم کرد و چووم دەستم پێکرد باش بیرم نییە بەڵام ئەوەندە چاوم لەسەر ژمارەی پەڕەکان نەبوو تابزانم لەکوێم و چەنم ماوە تەنها بەدڵ ئەمخوێندەوە ئەوەنەم نەزانی یەک پەڕەم مابوو. ئەو ڕۆژە زۆر دڵخۆش بووم وتم خۆ واش نییە کەمن لێی ترسا.

ئەو ڕۆژە زۆر دڵخۆش بووم وتم خۆ واش نییە کەمن لێی ترسا بووم پاشان چووم بە زۆری بەدەنگی سعد غامدی دامبەزاند و بەدایمی گوێم لێ ئەگرت لەکاتی ئیش کردن لەکاتی سەفەر تا خەوم لێ ئەکەوت گوێم لێ ئەگرت بەردەوام ڕۆژانەش ئەمخوێند وام لێ هات ڕۆژانە چەن جارێک تەواو ئەبوو دووبارە و سێ بارە ئەمکردەوە سەری پاشان دوای ماوەیەک وای لێ هات زۆربەیم لەبەرکردبوو ئەمە بۆمن پێشهاتەیەکی گەورە بوو پاشان ئەو ڕۆژانە کە ئەمخوێند لەدڵەوە زۆر دڵخۆش بووم گەر کێشەی دونیام هەبا لەناخەوە ئاسوودە بووم نەمەتوانی دڵتەنگ بم .

پاشان کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵ دەروونم باشە بۆمن کە ئێستا ئەبێت خەمبار بم بۆ ئێستا کە ئەبێ بگریم بۆ ناتوانم ؟؟؟ بۆ لەبری ئەم ئارامیەم دڵتەنگ نییم خۆمن کێشەم هەیە خۆمن هیچ شتێک بەدڵی من نییە ؟؟ ئەی خودایە بۆمن ئاوام ؟؟

ڕۆژ بەڕۆژ لەدوای وەڵامی ئەم پرسیارانە زیاتر بۆم دەرئەکەوت.

کە چەنێک ئاسودەییـــە بۆم دەرەکەوت ئەو ڕۆژانەی ئەیخوێنـم هەموو خێزانەکەم لەنـاخـەوە دڵخۆشـن بەدڵ پێ پێئـەکەنن

پـاشان ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر هەوڵی لەبەرکردنـی و زیاتر لەجارێک خوێندنەوەیم ئـەدا ،، مـاوەیەک ئەبێت لێی دابڕام وەک بڵێی شەیتان زاڵ بوەوە بـەسەرم نەمەخوێند دوای چـەن ڕۆژێک لەپڕ دڵم گیرا ڕاستی نەمەزانـی هۆکارێکی دابڕانـمە لەسوڕەتی بەقەڕە تەنانـــەت ئەو خـواردن و شیرینـیە خۆشانەی بـاوکم بۆی ئەهێنام کەپێشـتر بۆی ئەمردم ئێسـتاکە هیچ دڵم لەســەری نییە ئـێستاکە تەنانەت چێژ لەخەویش نابینم ئـێستاکە کەهـەموو شت باشە کەبـێ کێشـەم بۆ دڵم تەنگـە ؟؟ ئـەسڵەن من چ کێشەیەکم هەیـە تـا بەو شێوەیە دڵم بگیرێت کـە بیر ئـەکەمەوە هیچ ئەی بۆ خودایە گییـــان ؟؟

## بـەشی دووەم چیرۆکــ و تەجروبەکانم لەگەڵ سوڕەتی بەقەڕە

بـیر ئەکەمەوە ئـاخۆ خودایە گیانم بۆ دڵم تەنـگە لەکاتێـکدا هیچ کێشەیەکم نییـە لەکاتێـکدا هەمووشت بەدڵی مـنە ؟؟ ئەی خودایە گـیان ئەو خواردنە

خۆشـانە لەبەردەمی مـنن بـۆ چێژیان لـێ نابـینم بۆ هەستم بۆی نـاجوڵێ لەکاتێـکا پێشتر ئـاواتە گەورەکـەی من بوو ؟؟ ئێ خـۆ خودایە گیانم مـن هەموو ڕۆژ زیکر ئەکەم ئیستیغفار ئـەکەم ئێ خۆ قورئـانیش ئەخوێنم

بەڵام دڵتەنگیەکەم هەر کـەمێک نامێنێ دواتر دێتەوە دڵـم ماندوو ئەکات لـەگەڵ نوسـینی ئێستاکەم بۆم دەرکەوت خـۆ سورەتی بەقـەڕە تێکـەڵی ڕۆحم بووە مـن لێی دابڕاوم چـۆن لێی دابـڕام لەکاتێـکدا لەسەخترین کاتەکانم بووە شیفا بۆم ئەو کاتانەی حـەزم ئەچوە شیرینیەک و لەبەر دەسـتم نەبوو ئاواتم ئـەخواست و سورەتی بەقـەڕەم ئەخوێـند پـاشان وەک موعجیـزەیەک کەسێک ئەبوە بەهـانا تا من ئەو ئاواتە بچوکەم بێتە دی و شیرینیـەکە بخۆم

مـن چۆن لێی دابـڕام کەبەچاوانی خـۆم چەنەهـا جار موعجیزەکانـیم دیـووە ؟؟ چـۆن لێی دابـڕام کە بووە ئـارامی دڵە ماندوەکـەم ؟

چۆن دابـڕام لەکاتێـکدا ئەو ڕۆژانەی ئەمخوێـند ئەو شتەش دوعام بۆی ناکرد بۆی بەدی ئـەهێنام ئەوەش دوعـام بۆی ئەکرد بۆی بەدی ئـەهێـنام ڕێک وەک ئەوە نـاهــ گوناهـە بڵێم ڕێـک وەک ئەوەی خەیاڵی بـۆ ئەکەیت من ئـەڵێم لەوە جوانتـری پێ ئەدام من شـاهیدی ئەوەم خودا گیـانیشم ئاگادارە فێرە خۆڕاگری و میهـرەبانی فێری چێژ بینین لەعیبـادەت فێـری ئەوەی کردم کەدڵـخۆشی ڕاستەقیـنە لەگەڵ خوێـندنی سورەتی بەقەڕە دەسـت پێ ئەکـات

وەک وتـم گەر تۆ دونیات بەسەر ڕوخاوە دەست بکە بەخوێندنی سورەتی بەقـەڕە هەم لەدڵەوە ئارامت ئەکاتەوە هەم کـێشەکانت حـل ئەکات هەم

فێرە خۆڕاگریت ئەکات هەم بـەرەکەت ئەخاتەوە  هەموو شتێکتەوە

ببـــورن کەمێـــک زۆریش بـوو بەڵام هێشتاکەش ناگەتە نیـو ڕوبعـی وەسفـی ئەو سوڕەتە جائـەمە تەجرووبەی منە لەسەر سوڕەتی بەقـەڕە

خوێندنی سورەتی البقرە ئەوەندە گەورەیە تەنها مردوو زیندوو ناکاتەوە دەبێتە هۆی زیادبوونی بەرەکەت  ڕزق وڕۆزی گیرابوونی دوعا بەتاڵکردنەوەی سیحر و جادو و چاو و نەفەس خوێندنی سورەتی البقرە موعجیزەیە خۆشیەکی زۆر ڕووت تێدەکەت کە هەرگیز بەخەیاڵتدا نایەت لەبەرئەوە هەر لە ئێستاوە بەیەقینەوە دەست پێ بکەوبەچاوی خۆت بیبینە چۆن ژیانت ئەگۆڕێ بە ئیزنی خوای گەورە....یارب ژیانی هەموو موسوڵمانێک خۆش بکەیی..ئامیین

منیش حەز دەکەم چیرۆکی خۆم باس بکەم من ماوەی ٥ ساڵە بەدەست نەخۆشیەکەوە دەناڵێنم چومەتەلای هەموو دکتۆرەکانی سلێمانی و تەنانەت چوومەتە هەولێریش و ئیشاعەم ناردوە بۆ ئێرانیش دەیان وت ئەو نەخۆشیەی تۆ چارەسەری نیە دەبێت ئیلا عەمەلیاتی گەورە بکرێیت و قاچت بگۆڕیت بۆ پلاتین .منیش تەواو بێئومێد ببووم بەڵام لە پۆستێکدا گەوری سەڵاواتی إبراهیمیم بینی من خۆم پێشتریش هەر سوپاس بۆ خودا سلاواتم زۆر دەنار بەڵام إبراهیمی نەبوو دوای ئەو پۆستە دەسم کرد بە سڵاواتی إبراهیمی و وا زیاتر لە مانگێکیشە سورەتی البقرە دەخوێنم

ڕۆژانە سوپاس بۆ خودا قاچم زۆر فەرقی کردوە و چوومەوە بۆ لای دکتۆر دەڵێت چۆن وای لێهاتوە قاچت و چۆن بەرەو چاک بوون ڕۆیشتووە سوپاس بۆ خوای گەورە ئێستا بەرەو باشتر بوون دەچم من بەهۆی ئەو نەخۆشیەوە زەواجم دوا کەوتوە پشتیوان بەخودا بەردەوام دەبم و خوای گەورە زەواجم بۆ ئاسان دەکات یەقینم هەیە .ئێوەش لە دوعای خێر بێبەشم مەکەن. خوای گەورە پاداشتی هەمووان بداتەوەو دوعای هەموان قبوڵبکات پشیوان بەخودا

الحمدلله کە هیدایەتی دام بۆ خوێندنەوەی سورەتی البقرە بۆ ماوەی دوو مانگ ڕۆژانە هەموویم بەیەکەوە دەخوێندەوە لە سەرەتادا. دڵ و دەروونم زۆر تەنگ دەبوو لەگەڵی ئازارم هەبوو وە تاشم لەگەڵی دەگرت زۆر توشی ترس بووم بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانە دوای هەستم بە ئارامی و ئاسودەیی دڵ و دەروونم کرد وردە وردە ترس و ئازارو قەلەقیم نەما زیکرەکان و استغفارم دەگووت وە زیکری (لا حول ولا قوة الا بالله) وە سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ سورەتی الفاتحةشم دەخوێند ئێستاش ئاواتم ئەوەیە خودا لێم ڕازی بێ سوپاس بۆ خوا لەسەر ئەو هەموو ئارامی و ئاسودەییەیی دڵ و دەرونم بەهۆی ئەم زیکرو قورئانە بە هەموو تەمەنم بەردەوام دەبم إن شاءالله

کچێک دەلێت لەسەر سورەتی البقرە ... دەستم کرد بە خوێندنی سورەتی البقرە بە نیەتی زەواج بۆ ماوەی مانگێک سوپاس بۆخوا پاشان بەردەوام

بووم لە خوێندنی بە نیەتی حمل سوپاس بۆخوا داوای سالێک کچێکی جوانم بوو بە فەضل وگەورەی خوای گەورە

**یەک تێبینی لەسەر نیەت....**

کاتێک دەست دەکەیت بە خوێندنی سورەتی البقرە با وەک پەرستشێک بێت بۆ رەزامەندی خوای گەورە بڕوام پێبکەن هەم دونیا بەدەست دەهێنن ئەم بەهەشتی نەبراوە بەلام هەمیشە دوعا بکە و لە خودا داوابکە کە ئەوشتی نیەتە پێتی ببەخشێت.

سوپاس بۆخوا ٨٠ لە سەدی کێشەکانم چارەسەر بوون لە ماوەی مانگێکە بە بەردەوام بوونم لەسەر سورەتی بەقەرە . بەردەوام بووم لەسەر سورەتی البقرە بۆ ماوەی مانگێك و الحمدلله خوا خەمەکانی گۆڕیم و ناخۆشیەکانم نەمان و خەویشم بینی ڕاست دەرچوو.

خوێندنەوەی سورەتی البقرە بۆ ماوەی ٤٠ ڕۆژ دەستم پێکردو ١٠ ڕۆژ م تەواو کرد توشی کۆرۆنا بووم دەترسام بەس زۆر سوک بوو لەسەرم هیچ شتێکی وام نەبوو هەر بەردەوام بووم لەسەر خوێندنەوەی دوور لەماڵەوەو هەموو کەس خوێندنەوەکەم تەواو کرد بەردەوام بووم بۆماوەی ٤٠ ڕۆژ ڕێک ئەو ڕۆژە لەگەڵی کاروباری زەواجم بە وردی ڕێکخرا لەمانگی دەوە ئێستا دوای هەفتەیەک مارەکرام لە کەسێک کە هەر

نەمدەناسی هات بۆ ئەوەی سەیارەی خوشکم بکڕێ سەرسام بوو بە من و مارەی کردم هەزار جار سوپاس بۆ خودا.

## {چیرۆکی حەڤدەم}

شێخ محمد عریفی ئەڵێ : لە تەیارەیا بووم و یەکێ لە موەزەفەکان پێی ووتم: ژنەکەم چوار ساڵە هەموو ڕۆژێ سورەتی البقره ئەخوێنێەوە و لەو کاتەوە شت و مەك و زەخیره لە ماڵەکەم نابڕێ بە شەرتێ پێشتر هەرچییەکم بکڕیایە بەشی پێنج ڕۆژی نە ئەکرد بەڵام ئیستا هەر هەمان شت بەشی مانگێ زیاتر ئەکات و مناڵەکانم پێشتر زۆر بێ گوێ بوون و زۆر جار کێشەیان بۆ درووست ئەکردم بەڵام ئێستا زۆر گوێڕایەڵن و کێشەکانیان زۆر کەم بۆتەوە. ڕاستت فەرموو ئەی خۆشەویست: سورة البقرة أخذها بركة و تركها حسرة و لا تستطيعها البطلة (أي االسحرة).

واتە: خوێندنەوەی سورەتی البقره بەرەکەتە و وازهێنانی داماوییە و سیحرباز و جادوکاران ناتوانن لێی نزیکببنەوە. صلى الله عليه و سلم

**وە ئەمانەش کۆتایی چیرۆکەکان بوون.**

**نیعمەتی سورەتی بەقەرە نادۆزیتەوە تا دوای ئەوەی بەردەوام دەبیت لە خوێندنەوەی بۆ ماوەیەک کە ڕەنگە لە مانگێک زیاتر بێت!!!**



له سەرەتاوە بۆت ئەستەمە یەک جار بیخوێنیتەوە، لەوانەیە خەوت لێ بکەوێت، وە لەوانەیە قسەکانت ببڕدرێت، بۆیە دوای هەر نوێژێک ١٠ لاپەڕە بخوێنەوە.

ڕۆژان تێدەپەڕێت، و تێبینی ئەوە دەکەیت کە شارەزا بوویت، وە دەتوانیت لە دوو قۆناغدا بیخوێنیتەوە، بۆ نموونە دوای نوێژی عەسر و عیشا.

ڕۆژەکان تێدەپەڕن و کەش و هەوا ئامادە دەکرێت بۆ ئەوەی بە تەنیا بیت لەگەڵ قورئانەکەت و لە تاریکای شەودا بە تەواوی بیخوێنیتەوە لە ماوەی سەعات و چارەکێک زیاتر نەبێت.

دەبێتە جوانترین بەش لە ڕۆژەکەتدا، جوانترین شتیش کاتێکە کە بزانیت لە زۆر دووبارەبوونەوەی ڕۆژانەی خوێندنەوەیدا لەبیرت کردووە.

**وە ئەنجامی کۆتایی...**

ژیانت ٣٦٠ پلە دەگۆڕێت.. ژیان بۆت شیرین دەبێت.. پێگەت بەرز دەکاتەوە.. دەبێتە قەڵای نەبڕاوەت و سەرسام دەبیت لە بەرامبەری.

# {موعجیزەکانی سورەتی البقرە}

ئەگەر بەرەکەت لە ژیانتدا نەماوە سورەتی البقرة بخوێنە, ئەگەر لەخوێندن ئاستت باش نییە سورەتی البقرة بخوێنە, ئەگەر بەرەکەت لە کات وماڵتانا نەماوە سورەتی البقرة بخوێنە ، ئەگەر دوعاکانت گیرا نەبوە سورەتی البقرة بخوێنە، ئەگەر زەواجت نەکردوە سورەتی البقرة ثم سورەتی البقرة بخوێنە باشترین هاوسەر ئەبێتە نسیبت بەئیزنی الله.

ئەگەر منداڵت نابێت بێ هیوا کراوی سورەتی البقرة بخوێنە, ئەگەر نەخۆشیەکی قورست هەیە وەک نەخۆشی شەکرە و صەرەتان و زەخت و هەرنەخۆشیەکی تری جەستەی و دەرونی سورەتی البقرة بخوێنە, من پێت ئەڵێم ئەوەی ژیانی تاڵ کردوی سورەتی بەقەرە چارەسەری ئەکات تۆ مەڵێ شتی وابونی نییە سورەتی البقرة موعجیزەیە خودا هەدیەی کردوە بۆ مسوڵمانان چاوەڕێی کەی دەست پێبکەی ؟؟؟

تەنها لەبیرت بێت بەنیەتی بەرەکەت بیخوێنە ئەوکات خۆشت نازانی چۆن بەرەکەت ئەکەوێتە ژیانت

**ڕووداوێکم بەسەر هات زۆر زۆر حاڵم وێران بوو دەسەلاتم هیچ نەمابو و داوای موعیجزەیەکم کرد لەخوا**

دواتر لەجێیەك بینیم زۆر باسی سورەتی البقرەی تیابوو چەندین فەزل و دەسکەوت وتیان گەر بیخوێنی بۆماوەی هەفتەیەکبەیەقینەوە ئەوەی ئەتەوێ دێتە دی منیش دەستم پێکرد هەفتەیەك خوێندم نەشم توانیایە گوێم لێ ئەگرت نەم ئەهێش ئایەتێك تێپەڕێ بێ ئەوەی دڵم لای نەبێ

بزەبت پاش هەفتەیەك ئەوەی ویستم بوو تەنیا یەك هەفتەئیتر لەوکاتەوە الحمدلله نەمتونایەوە وازی لێبێنم ڕەحمەت و بەرەکەتی تەواو نابێت پێغەمبەر خوا صل الله علیه وسلم ئەفەرموێ خوێندن و دەسپێوەگرتبی رەحمەتە و وازلێ هێنانیشی حەسرەتە بەراستی رێك بەو جۆرەیە

پێت وایە ئەوەی ئەتەوێ هەرگیز ڕوونادات بەڵام لەوپەڕی بێ ئومێدی و نائومێدیت موعجیزەیەک دێ کە ئەو فرمێسکانەی توانات نەبوو بۆ ئازارەکانت دەرییبڕی لەخۆشی گیرابونی دوعاکانت دێنە خوار.



# {پرسیارەکان}

١ـ هەندێک لەخوشکان دەڵێن مامۆستا تۆ دەڵێی گوێ لەسوڕەتی البقره بگرە بۆ کاتێک گوێی لێ دەگرین ژانە سەر و دڵ توندی دەمان گرێ؟

لەوەڵامدا پێیان دەڵێم ئەم سوڕەتە چەند تایبەت مەندیەکی هەیە کاتێک ئەم کەسەی سیحری لێ کراوە گوێی لێ دەگری پاڵەپەستۆیەک لەناو لاشەو خوێنی ئەم ئینسانە دروست دەکات سیحرەکە بەرگەی ئەم سوڕەتە ناگری شەیتان تووشی ئەم دڵ توندی و ژانەسەرەی دەکا تا سوودی لێ نەبینی و وازی لێ بینی ئەگەر ئەم کەسە بەردەوام بوو لەسەری شەیتان و جنە ساحیرەکان لێی بێ ئومێد دەبن وازی لێ دەهێنن ئەگەر ئەم کەسە واز بێنێ شەیتان هەنگاوی زیاتر دەنێ لە عیبادەتەکانی تریش ساردی دەکاتەوە،

هەندێکی تریش دەڵێن دڵمان تێکەڵ دەکا بۆ ئەوەی بڕشێینەوە منیش پێان دەڵێم تۆ لە ڕێگای خواردن سیحرت لێ کراوە ئەم پاڵەپەستۆیە دروست دەکات تا سیحرەکە دەرچی جا لە ڕێگای ڕشانەوە دەیەوێ دەرچی

**وەڵام دراوەتەوە لەلایان باوکی عبدالله عبدالرحمان**

٢ـ باشە بۆ ئێمە سورەتی البقرە دەخوێنن و زکری ئێوارن و بەیانیان نیش دەخوێنین بۆ هەر سحرو چاو نەفس کارمان تێدەکات

و / تەبعەن زۆر کەس هەیە نیەتەکەی بۆ خوا نیە بەمەستم بەعامە قسەی دەکەم هەیە بۆ بەدەست هینانی شتێکە او شتانە دەخوێنێت یەکەم شت بەئیخلاس دەبی فی سەبیلیلا بخوێندرێ خوای گەورە إن شاءالله دەمان پارێزێ وە هەروەها. أنسان خۆی بەلاوازی دروست کراوە و زوو کاریگەری شتەکانی لەسەر دەردەکەوێت. هەروەک چۆن گەر خۆشت بپارێزیت توشی نەخۆشی جەستەیی هەردەبیت سەرەڕای چونە لای دکتۆر و عیلاجیش. ئەمەش هەر وایە الله تعالی بۆتی نوسیوە وهەرتوش دەبیت وەکو تاقیکردنەوەیەک لەهەمان کاتی کە دەردی داوە دەرمانیشی بۆداناوی.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو دەردێك دەرمانی هەیە

**١٣٩٧ـ** عَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: **(لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ، فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ، بَرَأَ بِإِذْنِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ).**

لە (جابر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی: (هەموو دەردێك دەرمانی هەیە، هەرکات دەرمانی ئەو دەردە دۆزرایەوە چاك دەبێتەوە بەئیزنی خوای گەورە

٣ـ بۆ ئێمە بەردەوام سورەتی البقرە دەخوێن و زکرەکان دەکەین شیفا مان بۆ نایەت وەکو ئەو خەڵکە باس دەکەن کە بۆ ماوەیکی کەم شیفایان بۆدێت

و/ هەرگیز نابێ پەلەی چارەسەر بکەین نەخۆش بۆنەخۆش دەگۆڕدرێ ئەمەش وەکوو هەرنەخۆشیەکی ترە جەستەو ڕۆحی کەسەکە بریندارە وپێویستی بەکاتە بۆچاک بوونەوە لەهەمان کاتدا ئەوکەسانەی ئەهلی تەوحیدن زووتر سوود لەچارەسەر دەبینن ئەوانەی هەر چارەسەر دەکەن و سودی لێنابینن دەبێ بزانن خەلەلێک لەشوێنیکی هەیە ودەبێ چارەسەری بکات بۆنو مونە من ئەگەر بمەوێ لەو شتە ڕزگار بم دەبێت فەرمانی الله پشت گوێ نەخەم لە لایەک چارەسەرەکان بکە موو لا لاییێکیش هەرچی گوناهە بکەم ئەم بابەتێکی زۆر گرنگ کە زۆربەمان خەڵەتی تێ دەکەین ئەویش ئەوەی کە دەڵێن باشە بۆ خەڵک دەڵێ من سورەتی البقرە م خوێند یان گوێم بۆگرت بۆماوەیک بە ئاواتەکانم گەیشتم باشە ئەی بۆ من هەر دەی خوێنم یان گوێی بۆدەگرم بۆ من ئەو ئاواتەم بۆ نایەتە دی بۆمن ئەوشتەی ئە مەوێ بۆم نابێت ، ئەو شتە خەتای خۆمانە سەرتا با بیر بکەینەوە بۆنمونە من حەزەکەم ئاواتێکم بێنمە دی بۆ ئەوشتە عیبادەت دەکەم نوێژەکانم لەکاتی خۆی دەکەم یان شەو نوێژ دەکەم یان سورەتی البقرە دەخەوێنم بەس بۆ ئەوەی ئەو ئاوەتم بێتەدی

جا هەڵەکە لێرە دا یە ئێمە بۆ الله ﷻ عیبادەت ناکەین تا ئەو لێمان ڕازی بێت چونکە ئەوشتەی کەمن ئاواتی بۆ دەخوازم ئەگەر الله ﷻ ویستی لەسەر نەبێت نایەت ئەگەر هەموو شتێک بکەم بۆ ئەوەی ئەو ئاواتەم بۆ بێتە دی نا با سەراتا الله ﷻ لەخۆمان ڕازی بکەین عیبادە تەکانمان با لەر ئەو بێت نوێژەکانمان قورئان خوێندنمان دوعاکانمان هەموو کارێکی چاک با تەنها لەبەر الله ﷻ بێت. ئەو کات هەمو ئەو شتانەی کە پێویستمان پێیە بۆمان کە خێری تێدایە الله ﷻ بۆمان دینێتە دی. ئەگەر ئە و شتەش کەئەت ویست بۆت نەبوو هیچ دڵ گران مەبە و بێئومێد مەبە چوونکە الله ﷻ ئەوشتەی بۆتۆ هەڵ بژار دووە ئەگەر بەجوانیش بیر لێ بکەینەوە بەخششێکی الله ﷻ ئەوە شتەی کە ئێمە حەزمان دەکرد بۆمان بێت بەخەیاڵی خۆمان دەڵێین بەئاواتی خۆم نەگەیشتم بێئاگا لەوەی کە ئەگەر خێری بۆت تێدابا الله ﷻ هەر پێ ئەبەخشی بەڵام الله ﷻ شتێکی دیکەی پێ بەخشیوی کە خۆت هەر هەستی پێناکەی تا لەکۆتایی بۆت دەر دەکەوێ هەر ئەو شتەی کە الله ﷻ بۆی داناوی هەر ئەوشتت هەڵ ئەبژارد

**وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ سورەتی البقره (٢١٦)**

واتە : شتێك کە ئێوە پێتان ناخۆشەو نایزانن لەوانەیە خێری تیا بێ بۆ ئێوە وە لەوانەیشە کە شتێکتان پێ خۆشەو هەوڵی بۆ ئەدەن بەڵام شەڕو خراپە

بێ بۆ ئێوه وه خوای گەورە خۆی باشتر ئەزانێ چ شتێك بۆ ئێوه باشه وه چی خراپه بەڵام ئێوه عیلمی غەیب و زانیاری نهێنی نازانن و زانیاریتان نییه عیبادەت مەکه بۆ ئەوەی ئاواتێکی دنیایت بۆ بێته دی ، عیبادەت مەکه بۆ ئەوەی زەواج وکچێک یان کوڕێکت بەنسیب بێت ، استغفرالله مەکه تەنها بۆ ئەوەی منداڵێکت ببێت ، بەڵکو عیبادەت بکه بۆ ئەوەی تەنها خودا لێت ڕازی بێت و لێت خۆشبێ چونکه هەر ئەوەنه خودا لێت ڕازی بوو هەموو ئەو شتانەت ئەیاتێ که تۆ ئەتەو، بۆیه بائاگا دار بین کاتێک دەست دەکەین به خوێندنی سورەتی البقره لەبەر خاتر ی الله ﷻ نیەتمان تەنها نزیک بونەوه بێ له الله ﷻ ئەگەر نا هیچ سودی لێ نابینین.

٤- سورەتی بەقەرەم خوێندەوە، کاروبارەکانم سەخت بوون و کێشەکان چەند هێندەتر بوون بۆچی ؟

و/ ئەم پرسیاره چەندین جار دووباره دەبێتەوه..

من سورەتی بەقەره دەخوێنمەوە، هەوڵ دەدەم کاروبارەکانم (ئاسانتر) بکەم، بەڵام دوای ئەوەی دەبینم که (کێشەکان) زیاتر دەبن و شتەکان (له سەختی)دان، دەچمه حاڵەتێکی شۆکەوه.

وە نەک هەر ئەوە.. بەڵکو تەنانەت کاتێک دەخەوم هەرگیز پشوو نادەم

خەونە پەمەییەکانم ڕەش بوون. وە هەموویان کابوسێکن کە تا ئەوپەڕی ترسناکن. لە خەودا خراپترین ئاژەڵ و خراپترین مێروو دەبینم. وە هەموو تابوتەکان دەبینم.. کوشتن و زینا و خراپترین شتەکان پێم سەیرە بۆچی دوای خوێندنەوەی سورەتی بەقەرە هەموو ئەمانە بەسەرمدا دێت؟ (خاڵی سەرسوڕمانێکی زۆر گەورە ‼)

بێگومان ئەمە زۆر ئاساییە، کاتێک تووشی نەخۆشییەکی ڕۆحی دەبیت، کاتێک تووشی لەدەست دانی خۆشەویستێک دەبیت، یان کاتێک تووشی چاوێکی ئیرەیی بەخش دەبیت، یان کاتێک تووشی سیحری جادووگەرێکی خراپەکار دەبیت. جەستە و ڕۆح و دەروونت هەرگیز وەک جەستەیەکی (ئاسایی) پۆلێن ناکرێت جەستەت لەژێر کۆنترۆڵی

شەیتانەکاندایە، ماوەیەکی زۆر دەژیت و زانیاریت لەسەر ئەم جنۆکە و کۆنترۆڵکردنی بەسەرتدا نەبوو، بارودۆخەکەت ئاسایی و ئاساییە. جاران پێت وابوو ئاساییە، شەیتانیش بە تەواوی فریوی دایت کە بەڕاستی (ئاساییە). تا دواجار بە هۆکارێک بڕیارم دا (بۆ خوێندنەوەی سورەتی البقرە). وە دەرگای دۆزەخت بۆ ئەم شەیتان کردەوە کە جەستەی تۆی ماندوو کرد و ژیان و پەیوەندییەکانی تۆی پەرش و بڵاو کرد بەبێ ئەوەی تۆ بزانیت. بە هۆکارێک بڕیارت دا سورەتی بەقەرە بخوێنیتەوە..

لە ڕاستیدا ئێوە بڕیارتان دا سزای لە سێدارەدان و سووتاندنی ئەم جنۆکە بسەپێنن. تۆ سورەتی بەقەرە دەخوێنیتەوە.. و کاروبارەکانت پەرش و بڵاو بوو.. و بارودۆخەکانت سەخت بوون و کێشەکانت زیاتر بوون.. ئەو هەموو ئەوانەت بۆ دەکات.. لەگەڵ دۆخەکەدا ململانێ دەکات،

بە هەموو نەفرەتی و هێزی شەیتانی خۆیەوە هەوڵ دەدات بۆ ئەوەی بمێنێتەوە لە جەستە و دەروون و ژیانتدا، تا زیاتر سورەتی بەقەرە بخوێنیتەوە، فشاری زیاتری لەسەر دروست دەبێت زیاتر و زیاتر. چونکە دەزانێت بەم شێوەیە ڕقت لە بەردەوامبوون لە خوێندنەوەی سورەتی بەقەرەت لێدەکاتەوە.

کاتێک بەئاگا دەبیت، دەتخاتە تەڵەوە، لە خەویشدا دەتخاتە تەڵەوە.

لەگەڵ کابوسە ترسناکەکان کە وات لێدەکات بە ترس و ترس و ئارەقکردنەوە لە خەو هەڵبستیت.

ئەمانە شێواز و ڕێگاکانی ئەون بۆ ئەوەی واز لە خوێندنەوە بهێنیت

چونکە (خوێندنەوەی سورەتی بەقەرە) مردنی حەتمییە بۆی

وە چاکبوونەوەی حەتمی نەخۆشی ڕۆحی، گرنگ نییە چەندە تەمەن یان سەخت بێت تەنها چەند ڕۆژێک ڕێگری لە کاروبارەکانت دەکات، خێزانەکەت و دەوروبەرت و تەنانەت ئازیزانت حوکم بەسەرتدا دەکەن، سەبرت هەبێت و لە ئەو بەهێزتر بە، واز مەهێنە و با بە شێوازە

شەیتانییەکانی بەسەرتدا زاڵ بێت.

بەهێزترین بە. وە تۆ لە کۆتاییدا سەرکەوتوویت.

دڵنیابە لەوەی سەرکەوتنت بەسەریدا مانای گۆڕینی ژیانت بە تەواوی دێت ئەو نەخۆشییە ڕۆحییەی کە نازانیت لە کوێوە هاتووە و چی لێکردوویت و چی لێ ڕێگری لێکردوویت، لێت نامێنێت. دەڕوات إن شاءالله و ژیانت وەک جاران دەگەڕێتەوە.

## **٥ ـ یـەقیـن چییـە ؟**

ئەو زانستەیە کەگومانی تێدا نییـە دڵـنیابوونە لەخودای بـاڵادەسـت و باوەڕی پـتەوە بەبونـی و هێزو دەسـەڵاتـی ، ئـەو باوەڕەیە کەتێـکەڵ بەکەمترین گـومان نەبێت یـەقین بـاوەڕێکـی پتەوە کەشـاخەکان لـەنگەر دەکات

ئـێمەی مرۆڤ زۆر جـار سەرلێشواو و نـائارام دەبـین ،، هۆکارەکەش ئەوە نییـە بـڵێین خودا ئـێمەی خۆش ناوێت توشی گرفتمان ئەکات نـەهـ ئەزیزم هـۆکارەکە دڵـو مێشکی خۆمانە کە خـودای خۆمانمان نەنـاسیوە نازانین بۆ بەدیهـێناویـن، هـەر بـۆیەش ئەکەویـنە دۆڵی گـومانەکـانمـاوەو بە خراپی ون دەبـین . کـەوایە چۆن یـەقین دروست بکەم لەدڵـمدا نەک لەسـەر زمان ؟؟

بۆ ئەمەش تێڕامانە لەدروستکراوەکانی خودا بیر لەدروست بونی مرۆڤەکان و دەریاو ڕوبارو تەنانەت ئاژەڵ و ڕوەکەکان بکەوە بیر بکەوە لەدوای هەموو شەوێک تاریک ڕۆژێکی ڕوناک بەڕێوە دێت

بیر بکەوە خودا چۆن ئاسمان و هەورەکان تەنانەت مانگ و خۆریشی بەسەرمان ڕاگرتوە. بیر لەو هێزەی خودا بکەوە کەهەموو ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژ دروست کرد ، مەگەر هەر ئەو زاتە کاروباری جیهانیان بەڕێوە دەبات ؟؟ گومان لەچی ئەکەیت ئەزیزم ؟؟

بیر لەوە بکەوە بۆچی خودا لەهەموو بەروبومێک جوتێکی بەرهەم هێناوە لەهەردوو جۆر ، تەسبیحات کردنی ئەم نیعمەتانە تۆ بەرەو یەقین دەبات بێ ئاگاداری خۆت ئەزیزی دڵم ، دڵە جوانەکەت پڕ دەکات لە ئاسودەی و ئارامی هەربۆیەش ئەوەی بە بیرکردنەوە قورئان بخوێنێتەوە و دڵ و مێشکی بکاتەوە و هەست بکات خودا ڕێنموویی دەکات بۆ ڕێبازەکەی، لە قورئاندا ڕۆحێکی سەرسوڕهێنەر هەیە، ڕۆحێک کە دەڕژێتە دڵەوە، ئەو ئارامیە ویەقینە لەڕۆحتدا تیشک دادەتەوە

یەکێکیش لەگەورەترین نیشانەی قبوڵ بونی دوعا یەقینە تۆ ناکرێت دڵت غافڵ بێت و دوعا بکەیت و چاوەڕێی وەڵامیش بیت ئەزیزەکەم

سـەرەتا چیرۆکی پێغـەمبەران بخوێـنەوە چیرۆکی هاوەڵانی پێغەمـبەران بیر لەدروست بونی بونەوەران بـکەوە تا بـگەیتە ئـەوپەڕی لوتکـەی یەقین ئیتر ئـەوکات دڵنیابە بێ وەڵام نابیت

## چیرۆکـێک لەسـەر یەقیـن

ئـافرەتێکی بەساڵاچوو بەڵام خوێندەوار و قورئان خوێن و خـواناس بوو ، لەناو خانویەکی کەلاوە دەژیا کەبنمیچ و سەقفی خانوەکەی داکەوتبـوو ،کوڕەکانی زوو زوو پێیان دەوت دایـە گیان توخوا لەم شوێنە بڕۆ نەوەک ئەو سەقفە بـەربیێتەوەو بـدرێت بەسەرتـا .

ڕۆژێـک ئافرەتە بەتەمەنەکە لەسـەر کاغەزێک شتێکی نووسی و دەقی کرد و دایە کوڕەکانی پێی وتن ئـەوکاغەزەم لەژێـر ئەو سەقفە بۆ دابـنێن ،کوڕەکانیـشی بێ ئەوەی کاغەزەکە بـکەنەوە دایان نا ڤوای بـیست ساڵ ئـافرەتەکە مـرد کەچی هێشتا سەقفەکە نەڕوخابوو وەک خـۆی مابوەوە ، پـاش ماوەیـەک کوڕەکانی کاغەزەکەیان دەرهـێناو کردیانەوە ئـەم دوو ئـایەتەی لەسـەر نوسرابوو **( ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ )** پـاشان نوسی بووی خودایە خۆت فەرمووتە ئاسمانەکانت بێ کۆڵەکەو سـتون ڕاگرتوە بێ ئەوەی لەڕێی خۆیان لـابدەن ئەی ئەوکەسەی ئاسمانەکانت ڕاگرتوە داوت لێ ئەکەم ئەو سـەقفەی منیش ڕابـگرە

لەدوای لابردنی کاغەزەکە بەرە بەرە سەقفەکە داکەوت کوڕەکانیش ئەیاونیست کاغەزەکە بکەنەوە ژێر سەقفەکە بەڵام لەماوەیەکی کورتدا سەقفەکە ڕوخا ،پاش ماوەیەک کوڕەکانی ئەو ئافرەتە زۆر سەرسام بوون پرسیاری مەلایان کرد و ڕوداوەکەیان بۆ گێڕایەوە

مەلاکە فەرمووی یەقینی دایکتان لەگەڵ یەقینی ئێوە زۆر جیاواز بووە دایکتان یەقینی بەخودای تاقانە بووە نەک کاغەزەکە بەڵام ئێوە یەقینتان بەکاغەزەکە بوە ئاخۆ گەر دایبنێنەوە سەقفەکە ناڕوخێت

## {لەکۆتایی}

وسبحان ربك رب العزّة عما يصفون، وسلامٌ على المرسلين والحمد لله رب العالمين.

داواکارم لە خودای گەورە کە هیدایەتی من و ئێوەش بدات و بمانخاتە سەر ڕێگە ڕاستەکەی خۆی و دینداریمان لەلا خۆشەویست بکات داواکارم لە الله ئەوی نەخۆشە ئەوەی دڵی توندە ئەوەی ئاواتێکی هەیە الله بۆیان ئاسان بکاتوو هەموو ناخۆشیەکیان لەسەر لا بدات.

زۆر سوپاس بۆهەموو ئەوانەشی کە چیرۆکەکانیان بۆ ناردووم وەسوپاس بۆ ئەوانەی هاوکاریان کردوم بەووشێیەکیش بێت الله لەهەموویان ڕازی پاداشتیان بداتەوە لەودونیاو قیامەت خوشک و برای

بەرێز ئارام بگرن لەسەر ناخۆشیەکانتان الله فەرمویتەی  وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ  واتە مژدە بدە بە ئارام گران جا بیر لەو مژدەیە بکەوە ئەبێ چی بێت  هەرگیزیش نائومێد مەبن لەرەحمەتی الله ئەگەر هەرچەندە ئەو ناخۆشیەیی ئێستا تێدای  درنگ بکێشێ خودای گەورە دەفەرمووێت:

**وَلَا تَيْأَسُوا مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِنَّهُ لَا يَيْأَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ سورەتی یوسف : ٨٧**

واتە :  وە بێئومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوای گەورە  بە دڵنیایی هیچ کەسێك بێئومێد نابێت لە ڕەحمەتی خوای گەورە تەنها کەسانێکی کافرو بێباوەڕ نەبێت

**«لە کۆتاییدا هەموو شتێک باش دەبێت، ئەگەر باشیش نەبوو ئەوا بزانە جارێ کۆتایی نییە»**

